زنجیرەی (١٠٠) کتێبی کوردی
ژمارە (١٢)



# سۆزی مینبەر

دانراوی
خوالێخۆشبوو
شێخ محمدی خاڵ

چاپی یەکەم
١٩٩٧ز ١٤١٨ک

زنجیرەی ( ١٠٠ ) کتێبی کوردی

ژمارە ( ١٠ )

# سۆزی مینبەر

دانراوی
خوالێخۆشبوو
شـێخ محمـدی خاڵ

چاپی یەکەم

١٤١٨ ک　　　　١٩٩٧ ز

❄ سۆزی مینبەر

❄ نووسینی : شێخ محمدی خاڵ

❄ چاپی یەکەم ١٤١٨ک - ١٩٩٧ز

❄ مافی چاپ پارێزراوە بۆ ناوەندی رۆشنبیر

سلێمانی -بازاڕی رایەڕین

❄ ژمارەی سپاردن ( -238- ) ساڵی ١٩٩٧

❄ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

# پێشەکی

زۆرن ئەوانەی کە خاوەن بیرو قەڵەمن وە توانای نوسینیان هەیە. هەریەکەو لە بوارێکدا کە پێی ناسراوە و هەست ئەکا کە دەسەلاتی زیاترە لەو بوارەدا وەک لە بوارە هەمە جۆرەکانی تری نوسیندا. بۆ نمونە لە زۆر کۆنەوە کوردستانمان شاعیرانی گەورەی تیا هەڵکەوتوون و تەنها بە شیعر توانیویانە هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتی و ئاینی خۆیان دەربڕن. مێژونوسانمان زیاتر تایبەتمەند بوون بە مێژووی کوردەوە و کەڵک وەرگرتن لەوبەسەرهاتانەی کە بەسەر میللەتە کەماندا هاتووە. هەربەم جۆرە لەبەشەکانی تری ڕۆشنبیریدا وەک چیرۆک و زانست و ئەدەبی شانۆگەری وزمانەوانی و کاروباری ئاینی و کۆمەلایەتی ورامیاری و زۆر رووی تری بیرو زانیاری.

لەم زۆر خاوەن بیرو قەڵەمانە کەمیان دەستیان داوەتە قەڵەم و بە نوسین خەباتیان کردووە و ئامادەبوون کە بەرنگاری دوژمنانی سەربەستی و شەوبیر بنەوەو تالاوی ژیان بچێژن لە پێناوی هۆشیار کردنەوەی گەلی کوردمان و پاڵ پێوەنانیان بۆ سوور بوون لە سەر مافەرەواکانیان، کە بە درێژایی مێژوو پێشێل کراون لە لایەن کار بە دەستانی ئەو ولاتانەی کە کوردستانی گەورەمان دابەشکراوە بەسەریاندا.

لەم نووسەرە کەمانەش زۆر کەمیان توانیویانە لە زۆر بواری جیاوازی فیکرو زانیاریدا بتوانن وەک پسپۆڕی شارەزا نووسینی بە کەڵکیان هەبێ و بەرهەمە کانیان هەر تازەو سوود بەخش بن. وەتۆزێ زەمانەیان لێ نەنیشن و کۆن نەبن و نەوەدوای نەوەتامەزرۆی خوێندنەوەیان بێ.

خوالێخۆشبوو (شێخ محمدی خاڵ) یەکێکە لەو نوسەرە کوردە بە ناوبانگانەی کە پتر لە پەنجا ساڵ هەموو ژیانی تەرخان کردبوو لە خزمەتی کوردا. وەقەڵەمەکەی بێ ماندوبوون لە کاردا بوو تا گیانی سپارد بەو خاکەی کە خۆشەویستی بۆی ؟؟ گەیشتبووە پلەیەکی زۆر بەرز چوبووە ناوناخی دەرونیەوە. شێخی خاڵ لە بواری ئەدەبی و زمانەوانی و کەلەپوری نەتەوایەتی و ئاینی وکۆمەلایەتی و مێژووییدا نووسەرێکی بێ هاوتا بو. وە بەرهەمەکانی لە سەراپا کوردستانی گەورە دناسراوە و جێی خۆی گرتووە لە دڵ و دەرونی گەلی کوردا.

دوای مردنی باوکم ماوەی دووساڵ زیاتر بە کتێبخانەکەیەوە سەرقاڵ بووم کە گەورەترین و بە نرخترین کتێبخانەیە لە کوردستاندا، بە تایبەتی دەسنوسەکانی. وە بەردەوام باوکم ئەیوت کە ئەم کتێبخانەیە گەورەترین سامانی میللەتی کوردە وبنیات نانی ئەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە(٣٠٠) سێ سەد

ساڵ لەمەوبەر. وەئەگەڕێتەوە بۆ زانای ئاینی گەورە (أبـو بكـر المصنف) کە باپیرە گەورەمانە. ئاواتی گەورەی باوکم ئەوەبوو کە کتێبخانەکەی لە خزمەتی خوێندەوارو ڕوشنبیری کوردا بێ. منیش بەو هیوایە ئەژیم کە لە بارودۆخێکی باشتری کوردستاندا بتوانم کتێبخانەکە کۆبکەمەوە بۆ خوێنەرانی بەرێز بۆ کەڵک وەرگرتن لێی.

دوای پشکنینی دەسنوسەکانی باوکم ئەم کۆمەڵە مقالاتەم دۆزیەوە کە بریتی یە لە (٢٣) مقالی ئاینی و کۆمەڵایەتی. کەبە مەزەندەی خۆم لە حەفتاکاندا نوسیویێتی وەتا ئێستا کە بڵاو نەکراوەتەوە. لەوەش ئەچێ باوکم بەبەرهەمهێنانی گرنگترەوە خەریک بووبێ و ئەم بەرهەمەی دانابێ کەلە کاتی خۆیدا بڵاوی بکاتەوە.

ئێستاش دوای پەیوەندیم بە برادەرانی کتێبخانەی ڕوشنبیر پێیان ڕاگەیاندم کە پرۆژەی چاپ کردنی سەد کتێبیان بە دەستەوەیە بۆ خزمەتی بیری ئیسلامی پیرۆز و هەستی کوردایەتی. وەحەزیان کرد کە یەکێک لەو کتێبانە لە نوسینی باوکم بێ.

منیش ئەم کۆمەڵە مقالاتەم بە چاک زانی کە شایانی بڵاو کردنەوەیە بە تایبەتی لەم بارودۆخە ناهەموارە دا کە کوردستانی خۆشەویستمان پیانەڕوات کە هەستی ئاینی ڕاست بە داخەوە کزبووە لە ناو خەڵکانی کوردپستاندا.

وەیەکێک لە کێشە سەرەکیەکانمان کێشەی اخلاقیە پێش کێشەی سیاسی، وەکردارو گفتاری لەیەکەوە دوورن و بەرژەوەندی تەسکی حیزبایەتی لە زۆر کاتدا ئەخرێتە پێش بەرژەوەندی گشتی.

هیوادارم کە مقالاتی ناوبراو جێی خۆی بگرێ لە دڵ و دەروونی خوێنەرانی خۆشەویستدا بە تایبەتی کە شێخی خاڵ یەکێک بوو لەو نوسەرو رابەرە ئاینیە دڵسۆزانەی کە کردارو گرفتاری وەک یەک بوون، کەئەمە خۆی لەخۆیدا هۆیەکی سەرەکی یە بۆ خۆشەویستی و ڕێزی خوێنەران بۆ شێخی خاڵ.

سوپاسێکی بێ پایان بۆ کتێبخانەی ڕۆشنبیری کە بایەخێکی زۆریانداوە بە نوسینەکانی باوکم و سوپاس بۆ ئەو دەزگایانەی کە بەردەوام لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانیان باسی ڕۆڵیان کردووە لە بواری کوردایەتی و ئاینی ونیشتمان و پەروەریدا و. ساڵانەی لە ڕۆژی مردنیا یادیان کردۆتەوە.

**خالد محمد خاڵ**

# کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە

**ئەی موسڵمانینە**

لەم ڕۆژانەدا سەری ساڵی کۆچی یە کە مانگی موحەڕەمە، وە موسڵمانان ئەچن بە پیر ساڵێکی تازەوە کە ساڵی ١٣٩٨ه.

ئەی موسڵمانینە کاتێک کە خوا بە ئایەتی (یا ایها المدثر. قم فانذر) فەرمانی دا بە پێغەمبەر(بە ڕاگەیاندنی ئاینی ئیسلام، پێغەمبەر دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵقی، هەر لەیەکەم ڕۆژەوە بێ بڕواکانی مەککە لێ ی ڕاپەڕین. وەک قورئان بۆمان ئەگێرێتەوە، دەمێ پێ یان ئەوت (معلم مجنون) دەمێ پێ یان ئەوت (ساحر کذاب) دەمێ پێ یان ئەوت (شاعر یتربص به ریب المنون) یەعنی محمد شاعرێکە وەک (زهیر) و(نابغة) چاوەڕوانی چورتمێکی ڕۆژگاری بۆ ئەکەین کە لەناوی بەرێت.

هەرچەندە پێغەمبەر (چەند ئایەتێکی قورئانی بۆ بهاتایەت و بیویستایە بیخوێنێتەوە لەناو خەڵقا، بێ بڕواکان ئەیانکرد بەغەوغاو قرە قڕ تا کەس گوێ ی لێ نەبێ وەک قورئان ئەفەرموێ (وقال الذین کفروا لا تسمعوا ا هذا القرآن والغوفیة لعلکم تغلبون).

ئەم بێ بڕوایانە هەر چێکیان لە دەست بهاتایە ئەیانکرد، دەمێ بە موسڵمانەکان پێئەکەنین و گاڵتەیان پێ ئەکردن، وەک قورئان ئەفەرموێ (ان الذین اجرموا کانوا من الذین امنوا یضحکون. واذا مروا بهم یتخافرون. واذا انقلبوا الی اهلهم انقلبوا فکهین. واذا رأوهم قالوا ان هؤلاء لضالون).

دوای ئەمانە ئنجا هاتن دەستیان کرد بە ئازاردانی هاوڕێکانی پێغەمبەرﷺ. وەزۆر کەس لە موسڵمانەکان لە ژێر ئازارو سزادا مردن، وە ئەمانیش لە ترسی خوا هەموو جۆرە ئازارو سزاو دەردی سەری یەکیان هەڵ ئەگرت. وەسیانزەساڵ لە مەککەدا مانەوە. وەلەم ماوەیەدا دووسەد کەسێک بەپیاو و ژن و منالەوە موسڵمان بوون. پێغەمبەر ﷺ بەرەبەرە. بە دزی یەوە، یەکە یەکەو دوودوو ئەیناردن بۆمەدینە و کۆچی پێ ئەکردن. گەورەکانی مەککە وەختێک چاویان کردەوە بینی.

یان کە موسڵمانەکان زۆریان کۆچیان کردووە بۆ مەدینە. وەزانیان کە پێغەمبەریش ﷺ دوای ئەوان کۆچ ئەکات. لە نیوە شەوێکا هەموو کۆبونەوە لە (دار الندوة) لە تەنیشت کەعبەوە. وەبە نهێنی بڕیاری کوشتنی پێغەمبەریان دا تادەرنەچووە. بەم ڕەنگە لە هەرتیرەیەک گەنجێکی شیر بەدەست دەوری ماڵەکەی بدەن، کەهاتە دەرێ بە هەموویان بی‌کوژن تا خوێنەکەی بڵاو

ببێتەوە بەناو هەموو تیرەکانا. ئەو حەلە بە خوێن ڕازی ئەبن، وەبە ئێجگاری ڕزگامان ئەبێ لە دەستی.

پێغەمبەر لە لایەن خواوە ئاگادار کرا بەم بڕیارە خوێناوی یە بە ئایەتی (واذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك او يقتلوك او يخرجوك ويمكرون ويمكر الله، والله خير الماكرين) *یەعنی کاتێک کە بێ بڕواکان بە دیی و خراپەیان لەگەڵ ئەکردیت کەحەپست کەن یان بتکوژن، یا لە مەککە دەرت کەن، وە ئەوان بە دیی خۆیان ئەکەن، وەخواش تۆڵەیان ئەداتەوە.*

بە هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە پێغەمبەر کەوتە خۆی، وەبڕیاری دا بە کۆچکردن لە شەوی ئایندەدا، هەروەک گەورەکانی قورەیشیش بڕیاریان دابو کە هەرلەو شەوەدا دەوری ماڵی پێغەمبەر ﷺ بگرن بۆ کوشتنی لە کاتێکا کە دێتە دەرەوە. پێغەمبەر مەسەلەکەی زۆر بە نهێنی گرت، وەلە قرچەی نیوەڕۆدا چووبۆ ماڵی ئەبووبەکر و فەرمووی کێ لەم ژوورەدایە بابچێتە دەرەوە. ئەبوبەکر فەرمووی هەردووکچەکەی خۆمن. چی بووە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ خوا ڕێی دام بە کۆچ کردن بۆ مەدینە، ئەبوبەکر داوای لێکرد کە لەخزمەتیا بێ. فەرمووی باشە، پێغەمبەرو ئەبو بەکر ڕێکەوتن لەسەر بەرنامەی دەرچونەکەیان. ئنجا پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆماڵی خۆیان، ئێواری کە تاریک داهات شیپر بە دەستەکان هاتن دەوری ماڵی پێغەمبەریان گرت. ئنجا بابزانین پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو سێ شەوەی کەلە ئەشکەوتەکەدا ئەمێنێتەوە چەند فیدایی یەکی دانا. وەکێ ی هەڵبژارد بۆ ئەو فیداکارییانەی کە ئەبێ بکرێ.

پێغەمبەر چوار فیدایی هەڵبژارد هەریەکەی بۆ کارێکی گرنگ، یەکەم (امامی عەلی) کە ئەو شەوە لە جێگاکەی پێغەمبەرا بنوێ بە نوێنەکانی پێغەمبەرﷺ.دووهەم (عبدا لله کوری ئەبو بکر) کە لە مەککە بمێنێتەوە بۆجوست و جۆ و دەنگ و باس وەرگرتن، تابە شەو ئەو دەنگ و باسە بباتەوە بۆ پێغەمبەرﷺ لە ئەشکەوتەکە.سێهەم (ئەسمائەی کچی ئەبوبکر)، کە لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا بووە، کە نیوەشەو لەگەڵ عبدا لله ی برایدا نان و ئاویان بۆ ببەن، عامری کوری فوهەیر کەشوانی ئەبوبەکر بوو - کەبە شەو گۆشت و شیریان بۆ بەرێت، لە پاشا ڕانەکەی بێنێ بەسەر ڕێگا کەدا تاشوێن پێ کان کوێر بکاتەوە.

ئەوشەوەی کە پێغەمبەرﷺ ئەیویست دەرچێ لە مەککە. قورەیشیەکان بە شیری ڕوتەوە دەوری ماڵی پێغەمبەریان گرت بۆئەوەی کە هاتە دەرێ بە هەموویان بی کوژن. ئەوشەوە پێغەمبەر هەرلە ئێوارەوە امامی علی لە جێگاکەی خۆی نواند. قورەیشیەکان هەرچەندە لە درزی دەرگاوە تەماشای جێگاکەی پێغەمبەریان ئەکرد -کەوا یەکێکی تیا نوستووە- دڵنیا ئەبوون

کەپیغەمبەر لە جێگاکەی خۆی دەرنەچووە، لەنیوەشەودا پێغەمبەر هاتە دەرەوە بێ ئەوەی کەکەس بی بینێ. وە ڕووی کردە ماڵی ئەبوبەکر. وەدووبە دوو رویان کردە ئەشکەوتی (ثور)- کەدوور لە ڕێگا. وەلە خوار شاری مەککەوەیە- بەیانی کە زانرا پێغەمبەر و ئەبوبەکر دەرچوون. بێبرواکانی مەککە بڵاو بوونەوە بەناوشارا، هێندێکیان چوونە ماڵی پێغەمبەرﷺ. لە( امام علی )یان پرسی کوا محمدو ابو بکر؟ فەرموی نازانم. ئەبوو جەهل چووە ماڵی ئەبوو بەکر لە ئەسمانەی کچی ئەبو بکری پرسی: کوا باوکت ومحمد؟ ووتی نازانم. وتی درۆ ئەکەیت. کە لەگەڵ شەپازللەیەکی پیا ماڵی گوارەکەی لە گوێ پەڕیی. وەهەرچەند لەگەڵیا خەریک بوو یەک ووتەی لە دەم نەهاتە دەرێ، سێ شەو لە و ئەشکەوتە تەنگەدا مانەوە، کە جێی قاچ ڕاکێشانیان نەبوو. قورەیشیەکان بەڵێنی سەد حوشتریان دا بەو کەسە کە بیاندۆزێتەوە. لەبەر ئەوە زەلام لە هەموو لایەکەوە دەرچوون بۆ دۆزینەوەیان.

ئەوانەی کە شوین پێیان هەڵئەگرت. وەپسپۆربوون لە دۆزینەوەی شوێن پێ دا. هەموویان کۆکردنەوە، تا بگەڕێن بە شوێن جێ پێ کانیانا، ئەوانە هەمویان دەستیان کرد بە گەڕان. وەڕۆین تا گەیشتنە بەردەمی ئەشکەوتەکە، لەو کاتەدا ئەبوو بەکر بۆ پاراستنی پێغەمبەرﷺ خۆی ئەنوسێنێ بە پێغەمبەرەوە، ئەڵێ: ئەگەر من بکوژرێم تاقە زەلامێک ئەکوژرێ. بەڵام گەر تۆ بکوژرێیت گەلێک لەناوئەچێ، پێغەمبەرﷺ بە دڵێکی بەهێز وەک پۆڵا. بروایەکی بێ هاوتاوە، ئەچرپێنێ بە گوێچکەیا ئەفەرموێ (لا تحزن ان الله معنا) *واتە غەم مە خۆ خوامان لەگەڵە*.

دوای سێ ڕۆژ گەڕان و سوڕانەوە بە دوویان، ئیتر بێ هیوا مان لە دۆزینەوەیان وەبڵاوەیان لێکرد. ئنجا پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر هاتنە دەرەوە لە ئەشکەوتەکە، وەبە پێ ی نەخشەیەک کەلەگەڵ عبداللەی کوڕی (أريقط) دا کردبویان لەوەپێش. عبدا الله بەخۆی و دوو ووڵاخەوە وێستابوو چاوەڕوانی ئەکردن.

لە سەرەتای مانگی رەبیع الاول، لەڕێکەوتی مانگی حوزەیرانی ساڵی (٦٢٢ز) پێغەمبەرﷺ و ئەبوبەکر لە مەککە دەرچوون، وەبە (٨) هەشت قۆناغی دووردرێژ گەیشتنە مەدینە. زۆر کەس لە پیاو ماقوڵانی شاری مەدینە، هاتبوون بە پیری یەوە. بە گاورو جولەکەو موسڵمانەوە. لە ماوەیەکی کەمدا مزگەوت و خانووی خۆی دروست کرد. وە هەرچی گەورە و سەر کۆماری مدینەبوو -کە ساڵەهای ساڵ بوو لەیەک زویربوو بوون- هەمووی ئاشت کردنەوە، وەدوژمنایەتی کینەیی کۆنی لەناویان هەڵگرت. وەدەستی هەریەکێک لە مەککەیی‌یەکانی خستە ناو دەستی یەکێک لە مەدینەیی‌یەکانەوە. وەپشتێنی برایەتی پێبەستن. وەبانگ دانرا. وەپێنج

فەرزە (بلال) بانگی ئەدا لەسەر بانی مزگەوت. وەیەکە یەکــە خـەڵق ئـەهاتن و موسڵمان ئەبوون. وە ئەحکامی دین دەستی کرد بـە هاتنـەخوارەوە. وە(قبلة) لە (بيت المقدس)ەوە بوو بە کەعبە. وەمەککە گیرا. وەقورەیش موسڵمان بـوون. وەئیسلامەتی بڵاو بووەوە بە هەموو عەرەبستانا. وەپێغەمبـەرﷺ لەسـەربانی کەعبەوە ڕووبەڕووی ئەودار الندوەیە وێستا کە هەشت ساڵ لەوە پێش بڕیاری کوشتنی پێغەمبـەریان تیـا دابـوو. وە ڕووی کـردە مەککەیی‌یـەکان و ئـازادی کردن.

لە ماوەی ئەم دەسـاڵی مەدینەیـەدا پێغەمبـەر دینێکـی عالـەمی و یاسـا و شـەریعەتێکی ئیسـلامی و حکومـەتێکی دامـەزراند لـە عەرەبسـتانا. کەئەمانـە هەریەکێکیان موعجیزەیەکە بۆ خۆی.

دوای ئەمە ساڵ بـە دوای سـالا هـات. وەمـانگی ( محـرم ) یـەک لەدوایـەک هاتووچوو. دەمێ بە خۆشی و دەمـێ بەناخۆشـی. دەمـێ بـە هـات دەمـێ بـە نەهات. دەمێ موسڵمانانی ئەبینی لە گەورەیی و بەرزی و دەمێ لە پەسـتی و زەبوونی‌دا. دەمێ لە نوستن دەمێ لە بێداری‌دا. بەلام -الحمد لله- هـەرگیز بـە مردوویـی نـای بینـێ. وا لەم چـەند سـاڵەی دوایی‌یـەدا موسـڵمانان بـە قســە بێداربونەتــەوە. خــوای بکردایــە بــە کـــردەوەش بێـــدار ببونایەتـــەوە. وە شانبەشانی دەوڵەتان بوێستانایە. خوا بیکات.

خوایە تاقە چرایەک کە لە هەموو دنیادا مابێتەوە. چـرای ئیسـلام و نـوری قورئانە. خوایە ئـەم چرایـە ئەگـەر خوانەخواستە بکوژێتـەوە. دنیـا ئـەبێ بـە تاریکستان و کافرستان. ناوی خوا لە جیهانا نامینێ. خوایە( مجدد )ێک بنـێرە بۆ دینەکەی خۆت کە تازەی بکاتەوە. وەئەم سـەگ و گورگانـە کـە ئەیانـەوێ ڕیشەی دەربێنن لـەباڵیان بدەی. وەخۆیـان بـە خۆیـان قڕکـە. وەک تائیسـتا کردووتە. خوایە ڕەحمێک. خوایە دەروویەک.



# دوور کەوتنەوە لە دین

**ئەی موسڵمانینە !**

دەستوور باوی خوایە لە دنیایەدا: هەرکەسێک یا هەر گەلێک دەستی دایە بێ دینی، وە لە فەرموودەی خواو پێغەمبەرﷺ دوورکەوتەوە. خوا تووشی بەڵاو (مصیبە)تی ئەکات بۆ ئەوەی بترسێ و بگەڕێتەوە وە تەوبە بکات وەلەخوا بپاڕێتەوە. شاهد لە سەر ئەم قسەیە قورئانە کە لە سوورەی (ئەعراف) دا ئەفەرمووێ:(وما ارسلنا في قرية من نذير الا أخذنا اهلها بالبأساء والضراء لعلهم يتضرعون) *واتە هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێتە سەر میللەتێک، ئەگەر بروایان نەهێنابێ. ئەو میللەتە مان دووچاری بەڵاو مصیبة کردووە. تا بترسن و ڕووبکەنە خوا، وەبپاڕێنەوەو بێنەوە سەر ڕێ ی ڕاست.*

هەروا لەسورەی (ئەنعام) دا ئەفەرموێ (ولقد أرسلنا الى امم من قبلك فأخذناهم بالبأساء والضراء لعلهم يتضرعون) *واتە ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بۆ سەر گەلانی پێشوو، تا بڕوا بێنن و خوا بپەرستن بەڵام بێ ئەمری خواو پێغەمبەرانیان کرد، ئێمەش بە بەڵاو مصیبە گرفتارمان کردن، بۆ ئەوەی بترسن و پەشیمان ببنەوە، تا خوا بەڵاکەیان لە سەر هەڵگرێ. وەکو ئەفەرموێ* (فلو لا اذ جاءهم بأسنا تضرعوا) *واتا وەختێک کە بەڵاو مسیبەتی ئێمەیان توش ئەبێ بۆچی تەوبە ناکەن و پەشیمان نابنەوە؟ تا ئێمەش بەڵاو مصیبەتەکەیان لەسەر هەڵگرین.*

ئەم دەستوری خوایە، وەک دەستوری ناوخۆمان وایە لە دنیادا، چۆن باوکێک کە کوڕێکی تاقانەی ببێ و غەڵەتێک بکات. باوکەکە نەسیحەتی ئەکات کە ئەوکارە جارێکی تر نەکاتەوە، وەئەگەر هاتو کردیەوە.باوکەکە لێ ی ئەدات. وەتا زۆرتری بکاتەوە باوکەکە خراپتری لێ ئەداتەوە. خواش دەرحەق بەبەندەی خۆی وایە. بەڵکو خوا سەد هەزار جار لەو باوکە بەرەحم ترە. دەرحەق بەبەندەکانی خۆی.

ئەی موسڵمانینە ! وەک چۆن هەمیشە لە ڕادیو ئەیبیستین وەلەو ڕۆژنامەکانا ئەیان خوێنینەوە. ساڵ نیە لە چەند لایەکەوە لە سەر زەوی. بوومەلەرزەی زۆر بەهێز و بەتەوژم ڕوونەدات. وەبەهەزاران ماڵ وێران نەکات. وەبە هەزاران مرۆڤ نەکوژێ و نەیانکا بە ژێر خاکەوە. یابە باران و لافاو هەزاران ماڵ ئاو نەیبا و ئادەمی نەخنکی و بریندار نەبێ. وەهەزاران خێزان بی

ماڵ و حاڵ نەمینیتەوە. یابەبای بەهێز و گێژەڵوکە شاران و دیهاتان وێران نەکات. وەهەزاران کەس بریندار و ماڵ وێران نەبێ. ئەوە شاری ( ئەغادیر ) لە جەزائیر کەچەند ساڵێک لەمەو پێش لەیەک دەقیقەدا بە بومەلەرزە غەوربوو. وەچوو بەناخی زەویدا. ئەوەچین کە چەند ساڵێ لەمەوپێش گەورەترین بومەلـــــــەرزەی تیـــــا بـــــــوو. وەشـــــــــاری ( تانغشـــــــــان ) -شارێکی پیشەسازیە- وێران بوو. وەملیۆنێک ئادەمی تیا کوژرا. وەبوون بە ژێر خانوو کارگەی گەورە گەورە وە. وەهێزی ئەوبومەلەرزەیە پانزە هەزار جار لە(قنبلة) زەرەکەی هیرۆشیما لە ژاپۆن بە هێزتر بوو. کە (قنبلة) هیرۆشیماش بە قەد بیست هەزار تەن مادەی ( تی. ئین. تی ) بەهێز بووە.

ئەوە تورکیا کەلە ماوەی ئەم بیست وسێ ساڵەدا هەشت نۆ دەجار بوومەلەرزەی زۆر بەهێزی تیا بوو. وەهەموو جارێک هەزاران کوژراو و بریندارو ماڵ وێرانیان بووە.

زۆر دوورنەرۆین ئەوەئەم گرانی یەی کەوا خێوەتێکی ڕەشی هەڵداوە بەسەر هەموو عالەما. وەژیانی تاڵ کردووە. وەنرخی هەموو شتێک ڕۆژ بەڕۆژ سەرئەکەوێ. لەگەڵ دەپانزەساڵ لەمەوپێشا یەک بە چل و یەک بە پەنجا زیادی کردووە.

خۆ ئەم نەخۆشی یەی کەوا بڵاوبۆتەوە لەناوماناـ هەرکەسێک تۆ تەماشای ئەکەیت یا نەخۆشی زەختی هەیە. یانەخۆشی شەکری هەیە. یانەخۆشی دڵی هەیە. یان نەخۆشی( ڕەبوو )ی هەیە. یان دوچاری نەخۆشی سەرەتانە. یا قورحەی معدەیە. یاشەلەلە. ئەمانە هەمووی ئینزارێکی خوان بۆ ئەم عالەمە ی کەوا ضاڵ و گومرا بوون. سا بەڵکو تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە. وەلەخوا بلاڵێنەوە کە عەفومان بکات و دەرگای ڕەحمەتی خۆیمان لێ بکاتەوە.

ئەگەر میللەتێک ضاڵ گومرا نەبووە. بۆ چی لەبازاڕو سەرجادەکان بە هەزاران جنیو ئەدرێت بە دین بێ ئەوەی یەکێک لەسەری هەڵبداتێ. یا بۆچی کوڕان جلی کچان لەبەر ئەکەن و کچان بەرگی کوڕان ئەپۆشن؟ ئێستا بە داخەوە کوڕان وەک کچان خۆیان ئارایش ئەدەن. وەپرچ و نەگریجە ئەهێڵنەوە.

یابۆچی ژنی موسڵمان. کە باوکی موسڵمان و مێردی موسڵمان و برای موسڵمانە. کەچی خۆی بە سوراوو سپیاوەوە. وەبەسەرو سنگی روت و قۆڵ و لنگی رووتەوە ئەسوڕێتەوە بەسەر جادەو ناوبازاڕا. بۆ مێردەموسڵمانەکەی. یابرا موسڵمانەکەی. یا باوکە موسڵمانەکەی مەنعی ناکات. یا بۆ ڕای عام قسە ناکات. ود استنکاری ئەم ئەحواڵە ناکات؟!!!

لەمانە لەهەمووی خراپتر ئەوەیە کە مرۆ بێ دینەکانمان لە علیە قورئان ئەدوون. وەئەڵێن: ئاڕای قورئان هەمووی پێچەوانەی مکتشفاتی علمی

ئەمرۆیە، لە کاتێکا کە هەرچی (مکتشفاتی علمی) ئەمڕۆ هەیە، قورئان هەزارو سێ سەد ساڵ لەمە وپێش باسی کردووە، وەک لە تەفسیری خاڵ جزمی یەکەما باسمان کردووە، کەئەمە گەورەترین معجزەی قورئانە کە ئەمڕۆ دەرکەوتووە، وەئەبوو بێ‌دینەکانمان هەموو بڕوایان بێنایە، وەبگەڕانایەتەوە.

ئەی موسڵمانینە! ئەمانەی کەباسمان کرد هێندێکن لە ئادابی ئەروپاییەکان کە ئێمە لەوانمان وەرگرتووە، وەچاویان لێ ئەکەین،وتقلیدی یان ئەکەین وەئەخلاقە جوانەکانی ئیسلام مان فەرامۆش کردووە، بۆیە خواش دووچاری ئەم هەموو تەنگانانەی کردووین.

ئەی موسڵمانینە! زۆر لە تەنگانەداین. باهەموولە گوناهی خۆمان تۆبە بکەین، وەیارمەتی دینەکەمان بدەین، وەئامۆژگاری ماڵ و منالەکانمان بکەین، سا بەڵکو خوا ڕەحممان پێ بکات، وەلەم تەنگانانە ڕزگارمان بکات.

خوایە ئێمە عەبدێکی ڕووڕەش و گوناهبارین، خوایە تەوبە و پەشیمانین، خوایە تۆش بە لوتف و میهرەبانی خۆت لێمان خۆش ببە، وەچاومان لێ بپۆشە، وەهیدایەتمان بدە بۆ ڕێگای ڕاستی ئیسلام، وە تەنگانەی ڕۆژگارمان لەسەر هەڵ بگرە.



# قورئـــــان

**ئەی موسڵمانینە !**

خوا لە تەعریفی قورئانا ئەفەرمووێ (لو انزلنا هذا القران على جبل لرأيته خاشعا متصدعا من خشية الله) *یەعنی ئەگەر قورئانمان بناردایەتە خوارەوە بۆ کێوێکی گەورەی سەخت، وەئەوکێوە وەک ئادەمی تێ گەیشتنی ببوایە، بێ گومان لە ترسی خوا، وەلەترسی ئەو هەڕەشەو گورەشانەی کەلە قورئانا هەن ئەوکێوە پارچە پارچە ئەبوو، بەلام ئادەمی بەم هەموو زەبوونی یەوە کەهەیە، نەلێی ئەترسێ و نەگوێی ئەداتێ بەڵکو هی واش هەیە کە خراپەی لێ ئەگرێ.*

قورئان پوختەو پالاوی هەموو ئاینەکانی پێشووە، وەتۆمارێکی پاک و تەمیزە بۆ ئەو هەموو ئامۆژگاری یە جوانانەی کە پێغەمبەرانی پێشوو بەرودوا پێشکەشیان کردووە بە کۆمەڵی ئادەمیی لەبەرەبەیانی مێژووە وە تائەمڕۆ.

قورئان کۆگایەکی زۆر گەورەو پیرۆزە بۆ ئەو هەموو پەندە بەرزانەی کە لە هەزاران ساڵەوە دراوە بە گوێچکەی ئادەمییدا لە لایەن نووح و ئیبراهیم و مووساو عیساوە.

قورئـان کورتـەی هـەموو هـەوڵ و تەقـەلای پێغەمبـەران و پیاوچاکـانی جیهانـە، لەگەڵ تاقی کردنـەوەو بەراوردی هـەزاران سـاڵی ئـادەمیی، کـە پێشکەشی ئەکات بە موسڵمانان بـۆ ئـەوەی ببـێ بـە توێشـووی ڕێگـای دوور درێژی قیامەتیان.

قورئان ئامۆژگارێکی دڵسۆزە وەک خەتیبێکی گۆیا. وابەسەر مینبەری خیتاباتەوە. هەمیشە هاوار ئەکات موسڵمانان کەئەم ئێشـە. باشـە بیکەن و ئەوەخراپە. مەیکەن. ئەوە دۆستتانە و ئەوە دوژمنتانـە. ئـەوەجێی مەترسی یە ئاگاتان لێی بێ و خۆتانی بۆ ئامادەبکەن.

قورئان نامەیەکی ئاسمانییە. هاتۆتە خوارەوە لەلای خواوە. بـۆ سـەر دڵ و دەرونی پێغەمبەری ئیسلام. بە هۆی جوبرائیلـی ئەمینـەوە. بۆ ڕاگـەیاندنی بەهەموو ئادەمیی سەرزەوی. بـەڕەش و سـپی و. سـوورو زەردی یـەوە. وەک خوا خۆی ئەفەموێ (تبارك الذي نزل الفرقان على عبده ليكون للعالمين نذيرا) یـەعنی *بەرزو گەورەیە ئەو خوایـە کـە قورئـانی ناردۆتـە خـوارەوە بـۆ بـەندەی*

*خۆی کە پێغەمبەرە. تا ببێ بە ترسێنەر بۆ هەموو ئامادەیی سەر زەویی، لەهەموو چەرخێکا، وەلە هەمووشوێنێکا تا ڕۆژی قیامەت.*

قورئان نامەیەکی دینی و، کۆمەلایەتی و، ئابووری و مێژوویی و، ڕەوشت و خوویی و، زانیاری و، سیاسی‌یە. دەستورو باوی خوا نیشان ئەدات لە دین و دنیا دا. وەهۆی پێشکەوتن و، پاشکەوتن و، مردن و، زیندووبوونەوەی گەلان پێش چاو ئەخات، لەبەرئەوە قورئان لەزۆر کۆنەوە بە هەموو زبانێکی زیندوو تەفسیرو تەرجەمە کراوە. وەعالەم بەهرەی لێ وەرئەگرن و ئیستفادەی لێ ئەکەن.

لە ڕۆژێکەوە کە قورئان هاتۆتە خوارەوە، موسلمانان بە دەست و بە دەم گرتویانە، وەلە گەلیا خەریکن، وەبە سەدەها تەفسیریان لێ‌نوسیوە و تەرجەمەیان کردووە، وەبە هەزاران کتێبیان نوسیوەتەوە بە خەتی زۆر جوان، وە بەبۆیە و زەرکەفت کاریی ئارایش دراوە، جگە لەوەی کە بەهەموو زبانێک تەرجەمە کراوە، وەهیچ مەکتەبەیەک نەماوە لە دنیا کە ئەمڕۆ تەرجەمەی قورئانی تیا نەبێ.

بەلێ قورئان ئەوەتی هاتۆتە خوارەوە عالەمێکی خستۆتە گەڕ. وە دەرگای زانین و زانیاری کردۆتەوە لە هەموو دنیا، وە بۆ زانینی قورئان هەزاران هەزار تەئلیف کراوە وعلم دانراوە لە لایەن عولەمای ئیسلامەوە، خوا جەزایان بداتەوە. وەئەمڕۆ( مکتبە )ی وا هەیە لە ( مەککە ) و ( مدینە ) و پایتەختی حکوماتی ئیسلامی، کەبە ملیۆن کتێبیان تیا هەلچنراوە بەڕەنگێک ئینسان کە ئەچێتە ناو ئەو مەکتەبانە، وەئەبینێ وا بە مەلایین کتێب نوسراوە و هەلچنراوە لە تەفسیری قورئان و، علومی قورئان و، ئەسراری قورئانا. بێ اختیار سامی لێ ئەنیشێ. وەبە ناچاری سەری شەرم و حەیا دائەنەوێنێ بەرانبەر بە گەورەیی قورئان.

هەر لەبەر ئەم تین و تەوژمی قورئانەیە لە دڵ و دەروونی موسلمانانا، کەسیاسی یەکانی ڕۆژ هەلات و ڕۆژ ئاوا، لە زۆر کۆنەوە، بە هەموو هێزو توانای خۆیانەوە ئەجەنگن لەگەڵ قورئانا، چ بە چەک و چ بە پارە چ بە فروفێڵ، وەئەیانەوێ ئەم تاقە چرایە بکوژێننەوە لە دڵ و دەروونی موسلمانانا. تابە تاریکی بمێنێنەوە وەهەرچێکیان هەیە لێ‌یان بدزن.

نابینن هەر دزێک کەبیەوێ بەشەو ماڵێک ببڕێ لەپێشەوە چراکانی ئەکوژێنێتەوە. وە تەلی کارەباکەی ئەبڕێ. ئینجا بە ئارەزووی خۆی تالانی ئەکات و گەسکی لێ ئەدات.

ئەمە کردەوەی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاتی‌یەکانە لە زۆر کۆنەوە. کە دەستی دزی و ناپاکیان درێژ کردووە بۆ وولاتی موسلمانان. وەهەر چێکیان چنگ کەوێ ئەیدزن و کێشەی لێ‌ئەکەن. تەنانەت لە کتێبە دەستنوسەکانیشیان.

ئـەمڕۆ پایتـەختێک نیـە لـە ڕۆژ هـەڵات و ڕۆژئـاوادا، وەک (لـەندەن)و (بەرلین)و(پاریس)و(ڕۆما)و(پەکین) کە یـەکی حـەفتا هـەزار و سـەد هـەزار کتێبی دەست نووسی ئیسلامی تیا نەبێ ئێستاش ئەو قسـەیەی کـە سـەرەک وەزیری ئینگلیز (گلادستۆن) کردوویەتی لە مجلس عمومی بـەریتانیادا، وەلـە ئاخر وئۆخری سـەدەی نۆزدە هـەروا دەنگ ئەداتـەوە لـە گوێچکـەی هـەموو موسڵمانێکی بە غیرەتـا، کـە بـە هـەموو بێ حـەیایی و بێ شـەرمی‌یەکەوە ووتویەتی: کۆسپی هەرە گەورەمان لە وولاتی ئیسلاما کە نایەڵێ بمێنینـەوە و جێ گیر ببین- دووشتە:

**یەکەم قورئان، دووەم کەعبە،** وەئەبێ ئەم دووشتە هەڵگیرێن و نەمێڵرێن، بـە هەر نرخێک بێ.

بەڵێ ئیستعمار، بە قورئانی ناوێ، چونکە قورئان وەک شاخەکانی قەندیل و پیرە مەگرون، لەبەر سێلاوی ئەوانا وێستاوە، وەهەموو لاپەڕەیەکی قورئـان شرینقەی مەردیی و نەبەردین، ئەیاندا لە موسڵمانان، وەجلەوگیریان ئەکات لە دۆستایەتی حکوماتی ئیستعماریی و تێکەڵی لەگەڵ بێبڕوایانا، ئەفەرموێ: (یا ایها الذین امنوا لاتتخذوا بطانة من دونکم لا یألونکم خبالا) *یەعنی ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە، دۆستـایەتی مـەگرن لەگـەڵ ئەوانـەی کـە هادینتـان نین، چونکە ئیفسادی ئەخلاقتان ئەکەن.*

وەئەفەرموێ: (لا تجد قوما یؤمنون بـالله والیوم الاخر یوادون من حاد الله ورسوله ولوکانوا اباءهم او ابناءهم او اخوانهم او عشیرتهم) *یەعنی ئەی پێغەمبەری خـوا، تـۆ یەکێک نادۆزیتەوە کە ایمـان و بـاوەڕی بـە خـواو ڕۆژی قیامـەت ببـێ و بچێ دۆستـایەتی بگـرێ لەگـەڵ دوشمنـانی خـواو پێغەمبـەرا بـا ئـەو دوشمنانەش باوکیان بن یان کوریان بن یان برایان بن یا خزمیان بن.*

زۆر دەمێکە ئەورووپا بەهۆی (مبشر)ەکانیانەوە خەریکن کەوەرمان بگێرن لە دینەکەمان، تا ئێستا نەیان توانی وە، بـەڵام ئەمـە حـەفتا هەشتا ساڵێکە دەستیان کـردووە بـە تێک دانـی بیرو بـاوەڕی هـەندێ لـە گەنجـەکانمان. نەخوازەلا ئەوانەی کە لـە (جامعـات)ی دەرەوە ئـەخوێنن. وە دەستـەیەکیان دروست کردووە لە ڕۆڵـەو جگـەر گۆشـەی موسـڵمانان کـە زۆر بـێ ئاگـان لـە قورئان و لە سەقافەتی قورئان، وەکردوشـیانن بـە داردەستی خۆیـان. بـەڵام خەیاڵیان خاوە، چرایەک کە خوا هەڵی گیرساندبێ، بە فووی دەمی ئەم و ئەو ناکوژێتەوە، خوا خۆی لەسورەی (تەوبە) دا ئەفەرموێ: (یریدون لیطفئوا نور الله بافواههم، ویابی الله الا ان یتم نوره ولو کره الکافرون) *یەعنی بێ بڕواکـان ئەیانـەوێ نووری خوا -کە قورئانە- بە فووی دەمیان بیکوژێننەوە، وەخـوا نـوری*

*خۆی تەواو ئەکات، وەئەیگەیەنێ بە پلەو پایەی خۆی، با بێ بڕوایانیش پێ یان ناخۆش بێ.*

دینی ئیسلام دینی خوایە، ئەبێ هەر بمینێ. (مصطفى كمال) کە بوو بە (رئیس جمهوری) تورکیا، خەلافەتی ئیسلامی هەڵگرت، وە حکومەتەکەی لەحکومەتێکی ئیسلامی یەوە کرد بە حکومەتێکی لادینی، وەحروفی عەرەبی کرد بە حروفی لاتینی. جاران کە موسڵمانان لەڕاستەوە بۆ چەپ ئەیان نووسی، ئەو کردی بە نووسین لە چەپەوە بۆ ڕاست وەک نووسینی ئینگلیزی، بەڵام لە پاش چەند ساڵێک کە (مصطفى كمال) نەما، دینی ئیسلام لە تورکیا چووەوە دۆخی جاران، بەڵکو ئێستا گەلێ گەلێ لە جاران بە هێز تر وە والحمد لله.

ئەی موسڵمانینە! ئاگاتان لە ئەخلاقی منداڵەکانتان بێ، چ کوڕ چ کچ، ئامۆژگاریان بکەن، ڕێ ی دین یان نیشان بدەن، بە منالی ئەگەر مامۆستاتان بۆ ڕاگرتوون دەرسی قورئانیان پێ بڵێن.

خوا ئاگاداریی خۆمان و بیروباوەڕمان بکات، سەرمان لێ تێک نەدات و ئاخر شەرمان نەکات.



# درۆ

**ئەی موسڵمانینە**

گوناح لەناو ئادەمی دا ئێجگار زۆرە، وە گەلێ جۆری هەیە. بەڵام هیچیان نابن بەدرۆ، وەهیچیان بە قەد درۆ پیس و ناشیرین، وەنەنگ و شورەیی نین. ئینسانی درۆزن لە ناو کۆمەڵــەی بەرزا زۆر زۆر سووک و ریسواو بێ نرخە. تەنانەت لە ناو ماڵ و منالی خۆشیا بێحورمەتە.

ئەم هەموو گوناهانەی کە هەن هێندێکیان لە ئاینێکێ حەرام و لە ئاینێکی ترا حەرام نین. یا شتێک لە ناو کۆمەڵەو گەلێکا نەنگ و بەدناوییە، کەچی لە ناو گەلێکی ترا وانییە. بەڵام درۆ لە هەموو ئاینێکا وە لەناو هەموو کۆمەڵ و گەلێکا ناشیرین ونەنگ و شوورەیی و بەدناوییە.

لە بەرئەوە زانایانی رەوشت وخوو (علمای اخلاق) لە قائمەی گوناهانا، درۆیان لەسەری سەرەوە داناوە، وەبە یەکەمین شتی پیس و ناشیرین یان داوەتە قەڵەم، چونکە درۆ کانگاو سەرچاوەی هەموو خراپی و گوناهێکە، وەمایەی هەموو ئاژاوەو ناکۆکییەکە، جگەلەوە کەنیشانەی نامەردی یە، یەکێک تۆزێک مەردیی تیا بێ درۆناکات.

باوەر ناکەم یەکێک ببێ لە جیهانا کە دووچاری زەرەرو زیانی درۆ نەبووبێ. وەدرۆ -وەک مار- پێوەی نەدابێ.

ئێمە ئەگەر بەچاوێکی ووردبوونەوە تەماشا بکەین، تێ ئەگەین کە ئەم هەموو ئاژاوەو ناکۆکییەی کەلەناوا هەیە، هەمووی مایەی درۆیە. ئەگەر درۆ نەبوایە هەموولایەک بەئاشتی و ئاسایش دا ئەنیشتن، وەکەس لە کەس زویر و دڵگیر نەئەبوو.

هەر درۆیە کە باوەڕی لەناو خەڵقا نەهێشتووە، وەکەس باوەڕی بە کەس نەماوە.

هەر درۆیەکە فرۆفێڵی بڵاو کردۆتەوە، وەدڵی خەڵقی لەیەکتر زویر کردووە، وەهەمووکەسێکی لەیەک پچڕیوە.

هەر درۆیە ئێشێکی وای کردووە کە هیچ کەسێک بە هیچ کەس باوەڕ نەکات و پشتی پێنەبەستێ.

هەر کۆمەڵ و گەلێک کەدرۆ لەناویا بڵاوبووەوە، ئەو گەلە ئەبێ نەمێنێ و لەناوبچێ، ئەو گەلە وەک گەلی (عاد) و (ثمود)ی لێ دێ کەخوا کردنی بەوانەی

ڕۆژگار. بە ڕەنگێکی وا کە بەردی بناغەی دیوار و تەپۆڵکەی خانووی ڕووخاویشیان نەماوە.
گەلێک چۆن ئەمێنێ وپایەدار ئەبێ کە هیچ کەسێکی باوەڕی بەهیچ کەسێکی نەبێ، وەهیچ زەلامێکی لە هیچ زەلامێکی دڵنیا نەبێ، وەهیچ کەسێکی لە سەرو ماڵ و ناموسی خۆی ئەمین نەبێ.
کۆمەڵێک چۆن ئەمێنێ، ئەوەندە دڕۆزن بێ، بە دیمەن بە دەمتەوە پێ بکەنێ و کەچی لە دڵا جۆرێکی تر بێ.
گەلێک چۆن پایەدار ئەبێ کە دڵ و زمانی وەک یەک نەبێ. کۆمەڵێک چۆن بەرقەرار ئەبێ کە قسەی وەک شەکر و مەبەسی وەک زەهری مار وابێ.
لەبەر ئەمانەی کە وتمان قورئان ناوی درۆ بەشتێکی زۆر زۆر خراپ و ناشیرین ئەبات. وەئەفەرموێ (انما يفترى الكذب الذين لا يؤمنون بايات الله) *واتا یەکێک درۆئەکات کە ئیمان و باوەڕی بە خوا نەبێ*، بەلام کە یەکێک باوەڕی بە خوا بوو. باوەڕەکەی ئەیگێڕێتەوە لە درۆکردن. وەلە ترسی خوا هەرگیز ناوێرێ درۆبکات، چونکە ئەزانێ خوا ئاگای لەهەموو قسە و گوفت وگۆیەکێتی. بەلام ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوا نیە، حەیاناکەن نەلە خوا و نەلە بەندەی خوا. بەڵکو بە درێژایی عومریان درۆئەکەن و بەدرۆئەکەونەوە. کەچی جارێک تەریق نابنەوە.
پێغەمبەر ( ئەفەرموێ (يطبع المؤمن على كل خلق الا الخيانة والكذب) *واتە ئەگونجێ موسلمان هەموو جۆرە خولقێکی خراپی بێ، بەلام هەرگیز ناگونجێ (خیانە) و درۆی بێ. یەعنی خیانەت و درۆ هەرگیز لەگەل ایمان و باوەڕا کۆنابێتەوە.*
دووبارە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ (اية المنافق ثلاث، اذا حدث كذب، واذا وعد خلف، واذا أؤتمن خان) *واتە نیشانەی منافق و ناپاک سێ شتە. یەکەم کە قسەی کرد درۆبکات. دووهەم کە بەڵێنیدا بەڵێنەکەی نەباتە سەر. سێهەم کە سپاردەیەکت لەلا دانا خیانەتی لێ بکات.*
پیاوی درۆزن هەر لە دنیا دا خوا تۆڵەی لێ ئەسێنێ. بەم ڕەنگە سوک و بێ نموودی ئەکات لە بەر چاوی هەموو کەسێک،.تەنانەت لەبەر چاوی ماڵ و منالی خۆشی. وەقسە ڕاستەکانیشی هەموو کەس بە درۆی ئەزانێ. ئەوحەلە. لە هەر ئیش و کارێکا بێ. سەرناکەوێ. بەلام پیاوی ڕاست گۆ. هەمووکەسێک باوەڕی پێ ئەکات. وەقسەی وەک سەنەد وایە. پێشینان ووتویانە: (ڕاست گۆ شەریکی دەولەمەندە) چونکە هەموو کەس باوەڕی پێ ئەکات. بەلام درۆزن کوڕی خۆی باوەڕی پێ ناکات.

قورئان زۆر باسی درۆ ئەكات، وەبەسەرو گوێلاكی درۆزندا دائەماڵێ. وەلە ٣١١ئایەتا ناوی درۆ ئەبات بەڕەنگێكی وا مەردوم ناوچەوانی لێ گرژكاو دڵی لێ تێكەڵ بێ.

هەروەك گڵۆپێكی سور كە هەڵكرا لە شوێنێك نیشانەی خەتەرە، ئەم ( ٣١١ ) جارەش كە لەقورئانا ناوی درۆ براوە. هەمووجارێكی وەك گڵۆپێكی سوور وایە كە نیشانەی خەتەرە، بۆ ئەوەیە تا مەردوم خراپەی درۆی لە بیر نەچێتەوە. وەلە هەموو لاپەڕەیەكی قورئانا تووشی ئایەتێكی وابێ، تا بزانێ كە شتێكی زۆر زۆر خراپ و خەتەر ناكە.

بۆ نمونە قورئان لە شوێنێكا ئەفەرموێ (ویل للمكذبین) *واتا وای بۆ درۆزنان*، لە شوێنێكی ترا ئەفەرموێ (ولا تطع المكذبین) لە شوێنێكی ترا ئەفەرموێ (وذرني والمكذبین) لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێ (وا الله یشهد ان المنافقین لكاذبون) لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێ (سماعون للكذب اكالون للسحت) لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێ (لایسمعون فیها لغوا ولاكذبا) لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێ (انا قد اوحي الینا ان العذاب على من كذب وتولى) لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێ (كذبت قبلهم قوم نوح) لەئایەتێكی ترائەفەرموێ (ان كل الاكذب الرسل فحق عقاب) هەروا لە هەموو لا پەرەیەكا ئایەتێكی وائەفەرموێ تالەدواییدا ئەفەرموێ (ثم نبتهل فنجعل لعنة الله على الكاذبین) *واتە* (لعنة)*ی خوا لە مەردومی درۆزن بێ*.

لە خوا داوائەكەین كە بمان پارێزی لە درۆ، وەئەم دەردە پیسە هەڵگرێ لەناومانا، تا هەموو لایەك وەك برادەست بكەینەملی یەك، وە بە خۆشی و برایەتی و ئاشتی بژین.



# کردو کۆشی

**ئەی موسڵمانینە !**

هیچ شتێک لای خوا بەقەد ئیشکردن و هەوڵدان گرنگ نی یە لە ژیانی ئادەمی‌دا، پێغەمبەر (ئەفەرموێ (ان الله کتب علیکم السعی فاسعوا) *واتە خوا ئیشکردن و هەوڵدانی لە سەر پێویست کردوون، تائەتوانن ئیش بکەن و هەوڵ بدەن.*

ئەی موسڵمانینە! ئیشکردن و هەوڵدان کلیلی دەرگای خۆشی و خۆشبەختی هەردوجیهانە. لە ئیشکردن باشتر شتێکی‌تر نیە. خوا لە قورئانا دەست کەوتنی دین و دنیای بەستۆتەوە بە هەوڵدانی ئادەمی‌یەوە. ئەفەرموێ:(وان لیس للانسان الاماسعی) واتە هەرچی ئادەمی بە هەوڵ و تەقەلای خۆی پەیدای نەکات دەستی ناکەوێ.

ئیشکردن وهەوڵدان لە هەموو کاتێکا. وەلە هەموو شوێنێکا شتێکی زۆر پێویست و گرنگە بۆ ژیانی ئادەمی. بەڵکو هەرچی ئەبینین لە ئاوەدانی سەرزەویی. هەمووی بەری هەوڵ و تەقەلای ئادەمی‌یە.

ئێمە ئەگەر وردببینەوە. تێ‌ئەگەین کە هیچ گەلێکی مردوو، بە بێ‌هەوڵ و تەقەلای رۆڵەو جگەر گۆشەکانی. زیندوونەبۆتەوە، وەهیچ خێزانێکی هەژاری زەبوون، بە بێ‌کۆشش و رەنجی پیاوەکانی. دەوڵەمەند نەبووەو. نەکەوتۆتە خۆشی‌یەوە.

ئەی موسڵمانینە ! گەورەیی و بەرزی گەلان بە پێی ئیشکردن و هەوڵدانی رۆڵە و جگەر گۆشەکانێتی. هەر گەلێک تارۆڵەکانی ئیشکەرو هەوڵدەر و. کۆڵ نەدەربن، ئەوگەلە لە سەرکەوتن و پێشکەوتن و بەرزبوونەوەدا ئەبن. وەهەر گەلێک رۆڵەکانی تەمەڵ و تەوەزەل و ئیش‌نەکەر بن، هەمیشە لە کەم بونەوە و لە ناوچووندا ئەبن.

هەر لە شاری سلێمانی‌دا گەلێ خانەدانی گەورەمان دی کە پیاوە پێشووەکانیان بە هەوڵ و تەقەلای خۆیان. خۆیانیان پێ گەیاند، تا گەیشتن بە پایەیەکی بەرز، لە پاش خۆیان بە هۆی منالی ناوەجاخەوە جێگاکانیان کوێر بووەوە. دارایی یان بلاو بووەوە و. خانویان فرۆشراو، ماڵ و منالیان پەرەوازەو، جێگاو رێگایان کەوتە دەست بێگانان.

ئەی موسڵمانینە ! هەوڵ دان و رەنج دان لە سروشتی ئادەمی‌دایە. واتە ئادەمی بە سروشت وا دروست کراوە کە لەگەڵ هاتە جیهانەوە هەوڵ بداو

ڕەنج بدات. تەماشاکەن منداڵ کە لە دایکی کەوتە خوارەوە، هێشتا چاوی نەپشکوتووە، کەچی دەست ئەکات بە گریان و هاوارهاوار و دەست و پێ جوڵان یەک لەسەر یەک. وەک بیەوێ هەموو دانیشتوانی سەر زەویی تێبگەیەنێ. وەپێیان بڵێ کە ئادەمی بۆ ئەوە دروست بووە کە بجوڵێ و ئیش بکات. وەهەوڵ و تەقەلا بدات. وەلەم هاتنەجیهانەیا زەربیەیەکی بەسەرەوەیە کە ئەبێ بیدا لە هەوڵ و تەقەلا و ڕەنج و کۆشش بەرانبەر بەو ساغی و تەندروستی‌یەی کە هەیەتی. وەبەو پارووە نانەی کە ئەیخوا و ژیانی خۆی پێ‌ئەپارێزێ. ئەگینا ئەبێ بەبار بەسەر کۆمەڵەوە. وەکۆمەڵیش بێ گومان پیاوی تەمەڵ و تەوەزەل و ئیش‌نەکەری ناوێ. وەهەمیشە پشت گوێی ئەخات.

ئەی موسڵمانینە! دانیشتن و ئیش نەکردن، ئەگەر پێچەوانەی دەستور و باوی جیهان بێ، بێ گومان پێچەوانەی ئاینی ئیسلامیشە. ئەوە قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ لە ڕۆژی جومعاندا کەبانگی نیوەڕو درا، دوکان هەڵگرن و بچن بۆ (جمعة) و گوێ بگرن لە خوتبە، کەلەگەڵ لێبوونەوە بڵاوەی لێبکەن. وەبە(کسب) و کاری خۆتانەوە خەریک بن. وەدوای رزق و ڕۆزیی خۆتان بکەون. ئەفەرموێ (یاأیها الذین آمنوا) *ئەی موسڵمانینە* (اذا نودی للصلاة من یوم الجمعة) *کاتێک لە* (جمعة) *دا بانگی نیوەڕۆ* (فاسعوا لذکر الله وذروا البیع) *دەست لە کڕین و فرۆشتن هەڵگرن، وەبە پەلە بچن بۆ جمعە* (ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون) *ئەم کردەوەیە بۆ خۆتان باشترە ئەگەر تێ بگەن* (فاذا قضیت الصلاة فانتشروا في الارض وابتغوا من فضل الله) *کاتێک کە نوێژی جمعە کرا، بڵاوببنەوە بەسەر زەویدا بۆ*(کسب) *وکار، وەبگەڕێن بە شوێن ڕزق و ڕۆزیی خوادا، بەڵام لەو حەڵەشا خواتان لە بیر نەچێتەوە، وەکو ئەفەرموێ* (واذکروا الله کثیرا لعلکم تفلحون).

ئەی موسڵمانینە! ئیش کردن و هەوڵدان کارێکی ناچاری‌یە، چونکە هەرچی هەوڵ نەدا، وەبەڕەنجی شان و عەرەقی ناوچەوانی خۆی نان پەیدا نەکات، نانی دەست ناکەوێ. تەماشاکەن ئەوە پێغەمبەران (دروودی خوایان لێ بێ) هەموو ئیشکەر بوون، وەبەڕەنجی شان و عەرەقی ناوچەوانی خۆیان ژیاون.

ئەوە داود پێغەمبەر (ئاسن گەر بووە. بە دەستی خۆی زرێی دروست کردووە و فرۆتویەتی.

ئەوە نوح پێغەمبەر (دارتاش بووە، وەبە دەستی خۆی کەشتی دروست کرد بۆ ڕزگار کردنی خۆی و موسڵمانەکانی لە تۆفان.

ئەوە موسا پێغەمبەر (کە هەشت ساڵ لە سەر یەک شوانی(شعیب) پێغەمبەر بووە.

ئەوە پێغەمبەر ی ئیسلام حەزرەتی محمد ﷺ تـا لای ئـەبو تـالیبی مـامی بوو. شوانیی بۆ ئەکرد. لە پاشا کە گەورە بوو ئنجا بە پارەی خەدیجەی کچی خووەیلد ئەچوو بۆ شام و تجارەتی ئەکرد. هیچ پێغەمبـەرێک نەیویستوە بـە خێری ئەم و ئـەو بـژی، وەهیـچ کامێکیـان هیچیـان لـە کـەس گلنەداوەتـەوە، وەهەموو ویستوویانە بەکردو کۆشی خۆیان بژین. چونکە کەسابەت لە هـەموو عبادەت و خوا پەرستییەکی گەورەترە.

ئەگێرنەوە کە کیسرای شای عەجەم -ڕۆژێ ئەگەرێ بە قەراغ شارا، چاوی بە پیرەمێردێک ئەکەوێ کە نەمام ئەنێژێ، شا پێی ئەڵێ: مامە بە تۆ چی ئەم نەمامانەی کە ئەیان نێژیت ؟ ئـەگونجێت تـۆ نـەمێنیت تـا ئەمانـە بەرئـەگرن. کابرا ئەڵێ: پاشام پێشینیان کردیان و ئێمە خواردمان، ئێمەش ئەبێ بیکەین، تانـەوە و وەچـەی دوای ئێمـە بیخـۆن، شـا قسـەکەی زۆر پـێ جـوان ئـەبێ و خەلاتی ئـەکات، کـابرا ئـەڵێ: پاشـام جـاران یـەکێک بـاخێکی بناشـتایە دوای چەند ساڵێک بەری ئەگرت، بەلام ئەم باخی منە لەگەڵ ناشتنیا بەری بۆ گرتم، شا ئەم قسەیەی پێ خۆش ئەبێ خـەلاتێکی تـری ئـەکات، ئنجـا کـابرا ئـەڵێ: پاشام نەمامی خەڵق ساڵی بەرێک ئەگرێ، بـەلام نەمامـەکانی مـن سـاڵی دوو جـار بەرئـەگرن، شـائەم قسەیەشـی زۆر پێخـۆش ئـەبێ، وە زۆر پەسـندی ئەکات. خولاسە ئیش کردن مایەی خۆشی و خۆشبەختی هـەموو کەسێک و هەموو گەلێکە، وەجیهـان جیهـانی ئیشـکردن و ڕەنـج دان و هـەوڵدان و کـۆڵ نەدانە، هەر کەسێک وە هەر گەلێک ئیشکەر بـێ، سـەربەرزو سـەرفراز ئـەبێ. وە هەر کەسێک یاهەر گەلێک تەمەڵ و تەوەزەل و ئیش نەکەر بێ. سەر شـۆڕ و چاو لە دەست ئەبێ.

سا خـوا بێدارمـان بکاتـەوە، تـا کـالای تەمـەڵی و تـەوەزەلی داکـەنین لـە بەرخۆمان، وەباڵی لێهەڵماڵین و داوێنی ئیشکردنی لێ بکەین بـە لادا. تـاوەک میللەتی قورئان ولاتەکەمان پێش بخەین لە هەموو ڕوویەکەوە.



# ئادابی ڕێگا

**ئەی موسڵمانینە !**

خوای گەورە. ڕێگاوبان و. جادە و کۆڵانی داناوە. بۆ هاتوچۆی ڕێبـواران. ڕێگا شتێکی زۆر پێویستە بـۆ ژیـان. کـەس هـەڵناکات بـەبێ ڕێگـا. وە کـەس ناژی بەبێ جادەو کۆڵان. تەنانەت ئەمڕۆ ئەندازەی شارستانیەتی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا. بەراورد ئەکرێ لە گەڵ ڕێگاوبانان. واتا هەر دەوڵەتێک تـا جـادەو ڕێگای زۆرتر بێ. وە ڕێگاکانی قیرتاوو پان و پۆڕو پاک و تـەمیزتر بێ. ئـەوە نیشانەی بەرزی و شارستانیەتی. ئـەو دەوڵەتەیـە. لەبەرئـەوە ئـاینی ئیسـلام ڕێگای زۆر لا مەبەستە، وەزۆر بـە تـەنگ ڕێ و بانەوەیـە. لەبـەر ئـەوە لادانـی بەردێک یان درکێک یا پارچە شوشەیەک لەسەر ڕێگای کردووە بە بەشێک لـە ئیمان و باوەڕ. پێغەمبەر ئەفەرموێ ﷺ (الإيمان بضع وسبعون شعبة:أفضلها قول لا اله الا الله، وادناه إماطـة الاذى عـن الطريـق) *واتــە ئیمـان حــەفتاو ئـەوندە بەشـە: هەرەچاکەکـەیان شـەهادەت هێنـان و. ووتنـی* (لاالـه الا الله) *یـە .وە هەرەبچوکەکەیان لادانـی شتێکە لـە سـەر ڕێگـا* . کەئازاری ڕێبـوار بدات. لـە داریابەرد. یادرک یاپیسی. یاهەر شتێکی تر. واتە هەر کەسێک شتێکی خراپی لەسەر ڕێی ئادەمی لابرد ئـەوە نیشـانەی ئیمـانی تـەواوە وەهەرکەسێک لای نەبرد ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە تەختەیەک لە ئیمان و باوەڕی ناتەواوە. ئـەی ئەگـەر یـەکێک لـە جیـاتی ئـەوەی شـتی خـراپ لەسەرشـەقام لابـەرێت. هـات جادەی پیس کرد. بەم ڕەنگە توێکلە کاڵەک و شووتی یا تلپەترێ و تەماتەی لێ فرێبـدات یـا تەنەکـە زبڵـی لەسـەر ڕۆکرد. یـا سـاوەری کوتـراوی لەسـەر بەباکرد. یا ڕێی لە مەردوم بڕی، یالەسەر جادە ویسـتاو ئـازاری خـەڵکیدا بـە گوفتار یابە کردار. ئەوە بێگومان شایستەی خەشم و قینی خوایە.

ئەی موسڵمانینە ! کۆڵان و جادە جێی هاتووچووی خەڵقی یـە. گـەورە و بچوک و ژن و پیاو بۆ ئیش و کاری خۆیان بە ناچاری پیا دێن وئـەچن. لەبـەر ئەوە هەموو کەسێک لـە جـادە و کۆڵانـا وەک یـەک بەشـدارە. وە حـەقی تیـا هەیە. هەروەک حەقی هەیە لە ئاوهـەوادا. لەبـەر ئـەوە ئـاینی ئیسـلام چـەند دەستورو ئادابێکی بۆ جادەو کۆڵان داناوە.

**ئادابی یەکەم:** نابێ کۆڵان پیس بکرێ. وەزبڵ و پیسـی لێ‌فـرێ بـدرێ. زۆرجار بە هۆی توێکلە مۆزێک یا توێکلە کاڵەکێکەوە کە فرێـدراوە. زەلامێک قاچی هەڵ خلیسکاوە و ڕانێکی شکاوە. یـا مورغـەی پشـتی زەرەردار بـووە. وەتوشی ئێش و ئازاربووە تامردن.

ئەوانەی کە لەدەرگاوە یالە پەنجەرەوە، یالەسەر بانـەوە پیسـی و چڵکـاو فڕێ ئەدەنە سەر ڕێگا، یابۆ ئیشێکی خۆیان چاڵێک هەڵئەکەنن لە کۆلانێکـا و شەو سەرەکەی نانێنەوە تا کوێرێک یا پیرەژنێکی لێئەکەوێ ئەوانـە بـە پێـی فەرموودەی پێغەمبەر دوورن لە رەحمەتی خوا.

ئـەی موسڵمانینە! ئاگاتـان لـە ئـادابی ڕێگـاو جادەکـان بـێ، شـارەوانی سلێمانی بـە هـەموو هێزو توانـایی خـۆی و کاربەدەستەکانی‌یەوە خـەریکی شارەکەن کەچی لە بەر پیسی و پۆخڵی خۆمان هیچی دیارنی یە.

**دووهەمین:** لە ئادابی ڕێگا -ئەگەر کوێرێـک یانەبەڵـەدێک، رێی لـێ‌وون بوو ئەبێ ڕێگای نیشان بدەن، وەئەگەر پێویست بوو، ئەبێ لە گەڵیا بـڕۆن تـا ئەیبەنە وە سەر ڕێی خۆی.

**سـێهەمین:** لـەئادابی ڕێگـا - نـابێ ئـازاری ڕێبـوار بـدرێ، ئەوانـەی کەبەکۆمەڵی ئەوێستن لەسـەر جـادە، وەهـەرچی بەبـەردەمیانا بڕوا پلارێکـی تێ‌ئەگرن، یا ناو و ناتۆرەیەکی لێ‌ئەنێن، یا هەر ئافرەتێک بەبـەردەمیانا بڕوا چاوی تێ‌ئەبڕن، وەبەچاوێکی ناپاک تەماشای ئەکەن، یـا دوایـان ئەکـەون. یا ڕووبەڕوویان دێن و شیعریان تێ‌ئەگرن، یا قسەی دڵداریان بۆ ئەهاوێژن. ئەوانە زۆرزۆر پەست و نامەردن، وەلە هەموو جۆرە مەردییەک بێ‌بەشن، خۆ ئێجگار ئەوانەی لە نیوەڕوانا، وەلـە کـاتی هاتنـەدەرەوەی کچانی مەکتـەب، دائـرەی خۆیان بەجێ‌دێڵن، وە لەسەر جادەکان قەتار ئەبەستن و بۆیان ڕائەوێستن. تا بەبەردەمیانا تێ ئەپەڕن، پێغەمبەرﷺ بەمانە ئەفەرموێ: (اذا لم تستح فاصنع ما شئت) *واتا کە شەرمت نەکرد چی ئەکەیت بیکـە*، یـەعنی کەحـەیاباری کـرد ئیتر نەشەرەف ئەمینێ، نە دین، نە مەردایەتی، ئەوانەی کە ئەگەنە ئـەم پایـە لە بێ‌ئەخلاقی‌دا، لە سەگی کۆلانەکان گەلێ کەمترن. ئەو ئافرەتانەی کە ئـەم بێ حەیایی‌یەیان لەگەڵ ئەکرێ کێن؟ یا کچانی ئەم میللەتەن، یـا خوشـکیانن، یا دایکیانن، یا خزمیانن، میللەتی بە شەرەف چۆن بە چاوی ناپـاک تەماشـای کەس‌وکاری خۆی ئەکات، ئەمە پیشەی یەکێک نی‌یە کـە ئیسـلام دینـی بـێ و قورئان پێشەوای بێ و پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری بێ.

سا خوا بە میهرەبانی خۆی ڕەحممان پـێ بکـات و بمـان هێنێتـەوە سـەر ڕێی ئیسلامیەت تا بەزەیی‌مان بە حاڵی خۆمانا بێتەوە، وە ڕۆژ بـە ڕۆژ هـەوڵ بدەین بۆ إصلاحی خۆمان.

# شەرم و حەیا

**حەیا** خوڵقێکی زۆر گەورەو بەرزە. لە هەر کەسێکا ببێ ئەو کەسە کاری ناشیرین ناکات. نە بەگوفتار و نەبەکردار. بەڵکو ڕقی لە شتی ناشیرینش ئەبێتەوە.

پێغەمبەر (زۆر تەعریفی شەرم و حەیای کردووە. وەپایە و پلەی حەیای بەرزکردۆتەوە. لە فەرموودەیەکا ئەفەرموێ (ان لكل دين خلقا، وخلق الاسلام الحياء) *واتە هەموو دینێک خوڵقێکی تایبەتی هەیە، وە خولقی ئیسلام شەرم وحەیایە*. واتا موسڵمان ئەبێ بە حەیابێ لەگەڵ خوا و پێغەمبەر و موسڵمانان و بگرە لەگەڵ هەموو کەسێکا.

هەر بەمەندە پێغەمبەر ﷺ وازی نەهێنا. بەڵکو پلەیەکی تریش بەرزی کردەوە، فەرمووی (الحياء شعبة من الايمان) *واتە شەرم وحەیا بە شێکە لەئیمان*. وئەوی حەیای نەبێ بەشێک لە ئیمانی ناتەواوە.

هەر بەمەندەش پێغەمبەر ﷺ وازی نەهێنا. بەڵکو پلەیەکی تریشی بەرزکردەوە. فەرمووی (الحياء والايمان قرينان) *واتا ئیمان و حەیا هاوتای یەک و بەرانبەری یەکن*. واتە کەحەیا نەبوو ئیمان نی‌یە، کە ئیمانیش نەبووحەیا نی‌یە.

پێغەمبەر ﷺ بەمەش وازی نەهێنا، بەڵکو لە جاری چوارەما پلەیەکی تریشی بەرزکردەوە، فەرمووی (الحياء هو الدين كله) *واتە حەیا دینە بە هەموو لق و پۆپێکی‌یەوە*، واتە هەرچی دین بیەوێ. حەیاش ئەیەوێ. وەهەرچی دین نەیەوێ حەیاش نایەوێ. بەڵێ حەیا لە خوا مانعی هەموو جۆرە بێشەرعی‌یەکە. هەروەک مایەی بەجێهێنانی هەموو فەرموودەو فەرمانێکی خوایە.

خاوەن حەیا دزی ناکات و ستەم ناکات و ماڵی خەڵقی بە خۆڕایی ناخوات و داوێن پیسی ناکات و بە چاوی ناپاکی تەماشای نامووسی موسڵمانان ناکات. چونکە هەمیشە خۆی لەژێر چاودێری خوادا ئەبینێ. وەئەزانێ ئەگەر ئەمیش چاوی لەخواوە نەبێ، خوا چاوی لەمەوەیە. لە هەر کوێیەک بێ، وە لە هەر کاتێکا بێ، وەلەهەر وەزعێکا بێ.

خاوەن حەیا. نیعمەتی خوای خۆی ئەبینێ کەوا بەسەریا ڕژاوە. وە لە تەپڵی سەریەوە تاکەلەموستی پێی دای‌پۆشیوە. ئنجا حەیای ئەم نیعمەتانە ئەیگێڕێتەوە لە هەموو جۆرە گوناهێک. بەڵێ حەیا تاجی سەری هەموو ئەخلاقێکی بەرزە.

حەیا لەنیعمەتا ( شکر ) کردنە. حەیا لە بەلا و مسیبەتا ( صبر ) کردن و دان بۆ خۆداگرتنە. حەیا لەقسە کردنا ڕاست گۆیی و ڕاست ووتنە. حەیا لەگەڵ باوک و دایک و خزم و خۆیشا سڵەی ڕەحم و چاکە و خزمەت کردنە. حەیا لەگەڵ ماڵ و دارایی دا سەخاوەت و دەست گوشادی و یارمەتی‌یە.

حەیا لەگەڵ هەژاران و زەبوونانا ڕەحمکردن و بەزەیی هاتنەوەیە. حەیا لەژنانا ( عفە )تو تاعەتو داوێن پاکی‌یە. حەیا لەگوناها تەوبە و پەشیمانی‌یە. حەیا لەجەنگ کردن لەگەڵ دوژمنانی ئایین و دیندا ئازایی و سەردانانە. حەیا لەکاتی حوکمدانا داد و عەدالەتە. حەیا لەکاتی سپاردەدا ئەمانەت و چاودێری یە.

ئادەمی کامڵی تێگەیشتوو، هەروەک حەیا لەخوا و لە بەندەکانی خوا دەکات، حەیالەخۆشی ئەکات، وە شتی ناپەسندی ناشیرین ڕەوا نابینێ بەخۆی.

کەواتە غەش کردنی هەموو جۆرە کاسبێک لەگەڵ خەڵقابێ شەرمی و بێحەیایی‌یە، درۆکردنی ئادەمی بێ حەیایی‌یە. نفاق و ناپاکی بێحەیایی‌یە. بوختان و دووزبانی لە ناو خەڵقا بێحەیایی‌یە. ناکۆکی پیاو لەگەڵ خێزان و ماڵ و مناڵ و خزم و خۆشیا بێحەیایی‌یە. چروکی و دەست قووچاویی لەگەڵ کەفتەکار و لێقەوماوانا بێحەیایی‌یە. پارە پەیداکردن لەڕێی نامەردی و بێشەرعیەوە بێحەیایی‌یە.

ئەوانەی کە لەنیعمەتی حەیا بێبەشن، ئەوانە لەنوری ئیمانیش بێبەهرەن. بۆیە بەئاشکرا گوناە ئەکەن، وەبێپەردە خۆیان دەرئەخەن، وە شانازی بە نامەردی و ناپیاویی‌یەوە ئەکەن. بەڕاستی ئەم جۆرە کەسانە شایستەی فەرمودەکەی پێغەمبەرن ﷺ کەپێیان ئەفەرموێ (اذا لم تستح فاصنع ماشئت) *واتا کە شەرم و حەیات نەکرد، چی ئەکەیت بیکە.*

عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ئەفەرموێ: ڕۆژێ چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، بەتەنیا دانیشتبوو ئەگریا. عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەگریت؟ فەرمووی ئێستا ( جبریل ) هاتە لام خەبەری دامێ کەخوا ئەفەرموێ: من شەرم ئەکەم لەبەندەی خۆم کە لە ئیسلامەتیدا سەرو ڕیشی سپی کردبێ و سزای بدەم بە ئاگری جەهەننەم، بۆ ئەوە ئەگریم ئایا نابێ ژن و پیاوی پیری سەرسپیش تۆزێ شەرم بکەن لە خوا، وەخۆیان بگێڕنەوە لە گوناهو خراپە.

لە خوا داوا کارم پەردەی شەرم و حەیامان لەبەر دانەماڵێ، وە ڕووزەردی لای خوا و پێغەمبەر و موسڵمانانمان نەکا.

# جۆرەکانی سوێند بە خوا

**ئەی موسڵمانینە !**

ئەو موسڵمانانەی کە سوێند ئەخۆن بەخوا، سێ جۆرن:

**جۆرێکیان:**

ئەوانەن کەوا فێربوون هەرچی بڵێن سوێندێکی لەسەر بخۆن، بێ ئەوەی کە سوێندەکەیان مەبەست بێ، بەم ڕەنگە بۆ شوێنێک ئەچێت و یەکێک ئەپرسێت ئەوە بۆکوێ ئەچیت؟ ئەویش ئەڵێ: بە خوا بۆ هیچ کوێ ناچم، لە کاتێکا کە بۆ شوێنێکیش ئەچێ.

یا قسە لەگەڵ یەکێک ئەکات و یەکێکی تر ئەپرسێ: ئەوە ئەڵێیت چی؟ ئەویش ئەڵێت: بە خوا هیچ ناڵێم، لە کاتێکا کە قسەش ئەکات.

یا دەمی ئەجوڵێت و شتێک ئەخوات، یەکێک ئەڵێت: ئەوە چی ئەخۆیت؟ ئەویش ئەڵێت: بە خوا هیچ ناخۆم، لە کاتێکا کە شتێکیش ئەخوات.

هەروەک ئەم سوێندانە وانە، سوێندی ڕێز و مجامەلە: بە خوا دانەنیشیت یا بەخوا ئەخۆیت، یا بە خوا ئەخۆیتەوە، یابەخوا ئەڕۆم، یابەخوا ئیشم هەیە. ئەم جۆرە سوێندانە خوا لە قورئان ناویان ئەبات بە **سوێندی (لەغو)**، واتە بەبێمەبەست بەسەر دەما دێن، وەهیچ مەبەستێکی سوێندی تیا نییە. وە کەس نایەوێ بەو سوێندە ناحەقێک بکات بە حەق، یاحەقێک بکات بە ناحەق، خوا لەسەر ئەم جۆرە سوێندانە کەهەر بەدەمەو بە دڵ نییە، ناتان گرێ، وەهیچ گوناهێکتان ناگات. وەک لە قورئانا ئەفەرموێ (لا یؤاخذکم الله باللغو في ایمانکم، ولکن یؤاخذکم بما عقدتم الایمان) ***واتە خوا لە سەر ئەو سوێندانە ناتانگرێ کە هەر بە دەم بێ و بە دل نەبێ، بەلام لەسەر سوێندێک ئەتان گرێ کە بەدل بەستبێتتان، وەمەبەستان بووبێ.***

بەلام لەگەڵ ئەم هەموو عەفوو چاوپۆشییەشدا کە خوای گەورە لە گەڵیا کردووین وە ئەم سوێندانەی لێنەگرتووین، پێویستە کە موسڵمان ئەوەندە بێ موبالات نەبێ، وەبەبێ هوودە ئەوەندە ناوی خوا نەبات و سوێندی پێنەخوات، وە بەشتێکی وا سووکی نەزانێ، وەهەوڵ بدا بۆ دەست لێهەڵگرتنی.

**جۆری دووهەم:**

سوێندێکە. یەکێک ئەیخوات لە سەر کردنی کارێکی خراپ. یا نەکردنی کارێکی چاک، لە پاشدا پەشیمان ببێتەوە لە کردنی کارە خراپەکە یا لە نەکردنی کارە چاکەکە. بەم ڕەنگە یەکێک بڵێ: بە خوا جارێکی تر ناچمە لای باوکم و دایکم، یالای خوشک و براکانم. یا قسە لەگەڵ فلان هاوڕێما ناکەم. یاداوای خێرێکی لێبکرێ. ئەویش بڵێ: بەخوا ئەم خێرە ناکەم. لەپاشا پەشیمان ببێتەوە. وەبیەوێ بچێتەوە لای دایک و باوکی. یالای خوشک و براکانی. یاقسە لەگەڵ هاوڕێکەیا بکات. یائەو خێرەی کە سوێندی خوارد نەیکات بیەوێ بیکات.

لەم کاتانەدا خودای گەورە و بەڕەحم، بۆئەوەی کە بەندەی خۆی ئەو کارە خراپانەی کە سوێندی لە سەر کردنیان خواردووە نەیانکات. یا ئەو کارە باشانەی کە سوێندی لەسەر نەکردنیان خواردووە بیانکات ڕێگایەکی بۆداناوە. بەم ڕەنگە ئەو سوێندەی کە خوراوە، بابیان شکێنێ. وەبچێتەوە لای باوک و دایکی. یالای خوشک و براکانی. یاقسە لەگەڵ هاوڕێکەیا بکات. یائەو خێرەی کە سوێندی خواردوە نەیکات - بابچێ بیکات. بەلام بۆ ئەوەی کەدڵنیای ببێ لە عفوو چاوپۆشی خوا، بچێ کەفارەتی سوێندەکەی بدات، وەک قورئان ئەفەرموێ: (فكفارته اطعام عشرة مساكين من اوسط ما تطعمون اهليكم، او كسوتهم، او تحرير رقبة) *واتا کەفارەتی ئەم جۆرە سوێندانە، کە شکا، نان دانە بە دە هەژار، لەو خواردەمەنیەی کە ئەیدەیت بە ماڵ و منالی خۆت، بەلام بەڕەنگێک کە نەزۆر لەخواردنی خۆت وماڵ و منالت خراپتربێ. وە نەزۆر لەو چاکتر بێ بەم ڕەنگە مام ناوەندی بێ. یا دە کراسیان بۆبکەیت. یا بەندەیک ئازاد بکەیت.* وەک خوا ئەفەموێ (فمن لم يجد فصيام ثلاثة ايام ذلك كفارة ايمانك اذا حلفتم، واحفظوا ايمانكم) *واتا ئەگەر یەکێ نەیتوانی لەبەر هەژاریی. یەکێک لەم شتانە بکات باسێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ. ئەمەیە کەفارەتی ئەو سوێندانەی کە ئەیخۆن و ئەیشکێنن. وەئاگاداریی سوێندەکانتان بکەن بەم کەفاراتانە.*

**جۆری سێهەم لە سوێند:**

ئەمەیە کە ئادەمیەکە. خۆی حەقیقەت و ڕاستیەکە بزانێ کە چیە. وهیچ گومانێکی تیا نەبێ. وەبە پێچەوانەی علمەکەی خۆی سوێند بخوات بۆ ئەوەی حەقێک بکات بەناحەق. یا ناحەقێک بکات بەحەق. بەم ڕەنگە قەرزی دە دینارت بەسەر یەکێکەوە بێ. داوای لێبکەیتەوە. کابرا بەدرۆ سوێند بخوات کە قەرزەکەی داویتەوە، وە خۆشی بزانێت کە نەیداوەتەوە. یا یەکێک بەدرۆ بەیەکێک بڵێ دە دینارم قەرز لەلاتە. بم دەرەوە. وەیەک لەسەر یەک سوێندی لەسەر بخوات. وەخۆشی بزانێت کە درۆ ئەکات پێغەمبەر ﷺ ئەم

جۆرە درۆیانەی ناوبردووە بە ( یەمینی غەمووس ) واتا سوێندێکە ئادەمی بە ئاگری جەهەنەما ئەباتە خوارەوە. تا تیانوقم ئەبێ، ئەم جۆرە سوێندانە هیچ جۆرە کەفارەتێکیان نییە، نووقوم بوون نەبێ لە ئاگری جەهەننەما، وەسوتان و برژان و قرچان نەبێ لە دۆزەخ.

پێغەمبەرﷺ ئەم جۆرە سوێندانەی داناوە لە ریزی گوناهە هەرە گەورەکان، وە کردوونی بە دووهەمی بت پەرستن و شەریک بۆخوا پەیداکردن، وەک قورئان ئەفەرموێ (فاجتنبوا الرجس من الاوثان واجتنبوا قول الزور) *واتە خۆتان بپارێزن لە بت پەرستی و سوێندی درۆو شەهادەتی درۆ و قسەی درۆ*، ئەمڕۆ لەم ڕۆژە پیرۆزەدا، وەلەم شوێنە موبارەکەدا، با پەیمانببەستین لەسەر دەستی خوا و پێغەمبەر ﷺ و ئەم موسڵمانانەدا، کە لەمەولا تابتوانین سوێند نەخۆین نەبەڕاست نەبەدرۆ. ساخوا هیدایەتمان بدا بۆ ڕێی دین، بۆ ڕێی ساڵحان و پیاو چاکان.

۞ ۞ ۞ ۞ ۞ ۞

# شەو ڕەوی پێغەمبەر ﷺ

**ئەی موسڵمانینە !**

پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی کە بوو بە پێغەمبەر ﷺ. سیانزە ساڵ لە مەککەدا مایەوە. وە بەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەی کە دای. دووسەد کەسێک موسڵمان بوون و بڕوایان پێهێنا، بە پیاوو ژن و منداڵەوە. وە لەو ماوەیەدا ئازار و سزایەک دران لەلایەن بێبڕواکانی مەککەوە کە هەرگیز شتی وا لەمێژوودا نەبووە و نەبیستراوە.

لەم سیانزە ساڵی مەککەیەدا. پێغەمبەر ﷺ لەدوای خوا دوو پشتیوانی بوو کە پشت گیرییان ئەکرد. وەخەم و خەفەتیان بەبائەدا. یەکەم خەدیجە خاتوونی خێزانی لە ماڵەوە. و دووهەم ئەبووتالیبی مامی لە دەرەوە.

خەدیجە خاتوون (خوا لێی ڕازی بێ) دەوڵەمەندترین ئافرەتێک بوو لە مەککەدا کە بە بازرگانییەوە خەریک بوو. وەدارایی یەکی زۆری بوو. وەلەیەکەم ڕۆژەوە بڕوای بە پێغەمبەر ﷺ هێناو موسڵمان بوو. وە هەرچەندە لە دەرەوە بێبڕواکان ئازاری پێغەمبەریان بدایە ﷺ و نارەحەتیان بکردایە. کە ئەهاتەوە ماڵەوە خەدیجە خاتوون بە پیرییەوە ئەچوو. وە بەدەوریا ئەهات و دڵخۆشی ئەدایەوە. وەهەرچی پارەو دارایی یەکی بوو هەمووی لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئیسلامەتی دا بەخت کرد. ئەبوو تالیبی مامیشی ڕیش سپی گەورەکانی قوورەیش بوو. وەلەبەر ئەو باش دەستیان نەئەچوود پێغەمبەرەوە ﷺ. وە زۆریان تیانەهێشتەوە. بەڵام ئەم دووانە بەرو دوا لە ساڵی یانزەهەمی پێغەمبەرێتیدا مردن. وە پێغەمبەر ﷺ بێ کەس مایەوە چ لە ماڵەوە چ لە دەرەوە. وە زۆر خەمبارو خەفەتبار بوو. وە ئەو ساڵە لەناو موسڵمانەکانا ناونرا بەساڵی (خەم و خەفەت). چونکە پێغەمبەر ﷺ زۆر خەمبار و خەفەتبار بوو تیایا، وەبێبڕواکان ئیتر دەستیان کرد بەبێحەیایی. جارێکیان لە نوێژا، وەلە حەوشی کەعبە (عەقەبەی کوڕی ئەبی موعەیت) بەخەی پێغەمبەر ﷺی گرت و ملوانکەی بادا تا نیوە خنکاوی کرد. وە ئەبو بکر هاواری کردوو ووتی (اتقتلون رجلا ان یقول ربي الله) *واتە ئەوە پیاوێک ئەکوژن کە بڵێ خوا پەروەردگارمە؟!*

ئینجا پێغەمبەر بێهیوا ما لەمەککە. وەبەناچاری بە جێیهێشتو ڕووی کردە (طائف) بەڵکو چەند کەسێک ئیمانی پێبێنن و یارمەتی بدەن. بەڵام زۆر بەزبری وناشیرینی قسەیان لەگەڵ کرد. وە گاڵتەیان پێ کرد. بەڵکو هەتیوی کۆڵانەکانیان تێ بەردا. وەدەستیان کرد بە بەردەبارانی. بەردیان ئەگرتە قاچ

و قولی تـابریندار ئـەبوو. وەخوێنـی لـێ ئـەهات. ئینجا لـەتاوانا دائەنیشـت و چیچکەی ئەکرد. ئینجا بەردیان ئەگرتە سەرو چـاوی تالـە تاوانـا هەڵئەسـتاو. ئەڕۆیشت. دووبارە بەردیان ئەگرتەوە قاچ و قولی تا کـەوت بەسـەر بـەردێکی گـەورەدا. ناچـار دانیشـت. لـەوێش وازیـان لێنـەهێنا بـەردەبارانیان کـرد تـا هەسـتاو ئەوێشـی بـەجێ هێشـت. هەربـەو ڕەنگـە دوایکـەوتن چەپڵـەیان لـێ ئەکوتا و هووهایان لێ ئەکێشا تا زۆر دوورکەتەوە لێیان. دەمەو ئێوارێ لـەبن دیـواری مـاڵی ( عەتەبـەی کـوری ڕەبیعـە )دا دانیشـت. بـەڵام هەموولەشـی خوێنـاوی. هیـلاک و مـاندوو. دڵشـکاو و بێکـەس. بێهیـواو بـێ دەرەتـان. هەردووچاوی پڕبوو لەئاو. سەرێکی بەرز کردەوە بۆبارەگای خوا. بـە ئـاهێکی ساردوو. چاوێکی پـڕ لـە فرمێسـک. دڵێکـی پـڕ لـە جۆش و خرۆشـەوە. ئـەم پاڕانەوە نزایەی کرد فەرمووی: (اللهم اليك اشكوا ضعف قوتي، وقلة حيلتي، وهـو اني علـى الناس يـا ارحـم الراحمين، أنت رب المستضعفين وانـت ربـي، الى مـن تكلـني؟ الى بعيـد يتجهمني، او الى عدو ملكته امري؟ ان لم يكن بك غضب علـي فـلا ابالي، ولكـن عـافيتك هـي اوسع لي، اعوذ بنور وجهك الذي اشرقت له الظلمات، وصلح عليه امر الدنيا والاخرة. ان تنزل بي غضبك، او تحل علي سخطك، لك العتبى حتى ترضى، ولاحول ولاقوة الابا لله).

ئەم دووعایەی کە پێغەمبەرﷺ کردی بەودڵـەی کـە پـڕ لـە کوڵـەوە. وەک برقیەیەکی مستعجل گەیشتە بارەگای خوای گەورە و میهرەبان. وەجێی خۆی گرت.

تـەبیعی خـوا بـە علمـی غـەیبی خـۆی زانیوێتـی کـە چـەند سـاڵێکی تـر بێبڕواکانی مەککە بریاری کوشتنی پێغەمبەرﷺ ئـەدەن. وە پێغەمبـەرﷺ بـە عومرێکی پەنجاو سێ ساڵییەوە ئەبێ لەهاوینێکی زۆر گەرما بەناچاری. وەبە دزییەوە هیجرەت بکـا بـۆ ( مدينـه ). وە لـە مەدینـەش ئەکەوێتـە نـاو کـۆڕی جولەکەیەکی زۆر و منـافقێکی زۆرەوە -کـەنیوەی قورئـان و لەباسـی خراپـی جوولەکەکان و منافیقەکانی مدینەدا هاتۆتە خوارەوە. کە ئاواتیان ئەوە بـووە پێغەمبـەرﷺ لەناوببـەن. وە خـوا زانیویـەتی کـە بێبڕواکـانی عـەرەب بـە دەسیسەو بەتەحریکاتی جولەکە عیلجارێی لەپێغەمبەر ئەکەن. وەبە دە هەزار شیر بەدەست و ڕم بەدەستەوە دێنە سـەری لەشـاری ( مدينـه ) بـۆ کوشـتنی خـۆی و هـەموو موسڵمانەکان. وەلـەو ماوەیـەدا دە. پـانزە. بیسـت جـارێک تووشی جەنگ و غەزای گەورە گەورە ئـەبێ لەگـەڵ بێبڕواکـانی عەرەبسـتانا. جگە لەوە کە ئەبێ لەم چەند ساڵی ( مدينـه )یـەدا قورئـان هـەمووی بـەوەحی بێتە خوارەوەو تدویـن بکـرێ. وە ئـەحکامی ( شرع ) هـەموو دابـنرێ و تـەواو ببێ. وتاسیسی حکومەتێکی ئیسلامـی بکرێ. یاساو قانونی بۆ ڕێک بخرێ.

ئنجا ئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ بـەو هـەموو خـەم و خەفـەت و مەئیوسـی و بێهیوابیـەوە بمێنێتـەوە. وەئـەم هـەموو بـارە قـورس و گرانانـەی کـە لـە پێشیەوەیەتی بۆی هەڵنەگیرێ. ئەو حەلە لەوانەیە کەپێغەمبەریش ﷺ وەک

حەزرەتی یونس ﷺ مەئیوس ببێ. وە دەست لە پێغەمبەرێتی‌یەکەی هەڵگری. وە ئوممەتەکەی بەجێ بێڵێ. وەک خوا لەقورئانا پێی ئەفەرموێ (فاصبر لحكم ربك ولا تكن كصاحب الحوت اذ نادى وهو مكظوم) *واتە دان بەخۆتا بگرە و چاوەڕوانی فەرمانی خوا بکە. وەلەبێ (صبر)ی‌دا وەک یونس پێغەمبەر مەبە کە فراری کردوو (وەظیفەی) پێغەمبەرێتی بەجێهێشت.*

خوا ئەمانەی هەموو ئاگا لێبوو. وە ئەیزانی کە پێغەمبەر بەم هەموو خەم و تەم و دەردی سەری‌یەوە ئەم بارە قورس و گرانەی بۆ هەڵناگیرێ. وە لەوانەیە کەمورەغەی پشتی بشکێ لە ژێر باری قورس و گرانی پێغەمبەریەتی‌دا، وەک خوا خۆی لەسورەتی (الم نشرح)دا ئیشارەت دەکا بۆ ئەم حاڵەتی نەفسانی پێغەمبەرە بەئایەتی (ووضعنا لك وزرك الذي انقض ظهرك) *واتە ئایا دڵمان گوشاد نەکردیت. وەلامان نەبرد لەسەرت ئەوبارە گرانەی کە پشتی قورس کردبوویت؟!.*

ئنجا بەم هۆیانەوە خوا ویستی بیبا بۆلای خۆی و دڵخۆشی‌یەکی بداتەوە. وەتۆزێک خەم و تەمی بە بابدات. وە پاشەڕۆژی بۆ ڕوناک بکاتەوە. وە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی لەگەڵ کەمێک لە (ئایات)و(معجزات)ی خۆی نیشان بدات بە ڕەنگێک کەوا پشت ئەستور ببێت کە ئیتر بە هیچ لێکنەبێت، وەبتوانێ هەموو بارێکی قورس و گرانی پێغەمبەرێتی هەڵگرێ.

پێغەمبەرﷺ بەبرینداری ولەش خوێناویەوە لە طائف گەڕایەوە بۆ مەککە. لە پاش ماوەیەکی کەم و لە شەوی بیست و حەوتی مانگی ڕەجەبدا خوا حەزرەتی جبریلی نارد بە شوێنیا کە بیبا بۆ بارەگای خوای گەورە. تا لە عالەمی ئیسلاما زۆر شتی نیشان بدات. وە کەمێک لە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا بە چاوی خۆی ببینێ. پێغەمبەر (خێرا هەستاو دەست نوێژێکی شت و ڕۆیشت لەگەڵ جبریل‌دا گەیشتنە مسجد الأقصی لە فەلەستین. وەک قورئان ئەفەرموێ (سبحان الذي اسرى بعبده ليلا من المسجد الحرام الى المسجد الاقصى الذي باركنا حوله لنريه من آياتنا انه هو السميع البصير) *واتا پاک و بێنەنگە ئەو خوایەی کە لەشەوێکی پیرۆزدا بەندەی خۆی کە محمدە بردی لە مسجد الحرامی مەککەوە بۆ مسجد الأقصی لە فەلەستین کە بەرەکەتمان ڕشتووە بەسەر دەوروبەریا. تا نیشانی بدەین هێندێک لە ئایەتو معجزاتی خۆمان.*

لە مسجد الأقصی ئەرواحی هەموو پێغەمبەران حازربوون. وە پێشوازی‌یەکی زۆر جوانی پێغەمبەریان کرد. وە لەوێوە پێغەمبەر برا بۆ خزمەت خوا. وەشەوو ڕۆژیی پێنج نوێژی لەسەرخۆی و ئوممەتی دانا. تا بەو نوێژانە لە خوا بپاڕێتەوە. وە بەهۆی ئەونوێژانەوە زاڵ ببن بەسەر نەفس و

شەیتانا. وە ڕەووشت و خووی جوان لە دلّیانا بڕوێ. وە دلیان پـاک ببێتـەوە لە هەموو نەخۆشی یـەکی دلّ و دەروونـی. وە بەیارمـەتی ئـەو نوێژانـەوە زاڵ ببن بەسەر هەموو قۆرت و گرێ یەکی ژیانا.

خوا نوێژی وەک فەرزەکانی تر پێویست نەکرد لەسەر زەوی. بـەم ڕەنگـە ئایەتێک بنێریتەوە خوارەوە بفەرموێ: نوێژم لەسەر فەرز کردن. بەڵکو نوێژی لە ئاسمان. وەلەناو کۆمەڵی فریشتەدا فەرز کرد. بۆ ئەوەی نیشـان بـدات کـە نوێـژ لـە هـەموو فـەرزەکانی تـر گـەورەترو پـیرۆزترە. وە کۆڵەکـەی بـڕوا و ئیسلامەتی‌یە. وەبەبێ ئەو. ئیسلامەتی ڕاناوەستێت و پایەدار نابێ. ئنجا هـەر کەسێک حەز ئەکات خوای گەورە عروج بکات بە ڕۆحـی. وەلەگـەڵ مەلائکـەی ڕەحمەتا بیبا بۆ ساحەی عەفوو غوفرانی. با پێنج فەرزەکەی بکـات. وە دوای ئەخات. وەبەهۆش و گۆش و خوشووع و خضوعەوە نوێژەکانی بکات. خوا لـە دەریای کەرەم و. ڕەحم و. مەرحەمەتی خۆی بێبەشمان نەکات. وەلـە بـەلای ئەرز و ئاسمان بمانپارێزێ.



# قومــــار

**ئەی موسڵمانینە !**

لـەم ڕۆژانـەدا قومـار وەک دەردی ئاولـە بڵاوبۆتـەوە لـەناو گەنجـەکانمانا. وەلە سەدا شەست فێری قومار کردن بوون. وە ڕۆژ بەڕۆژ زیـاتر ئەتەنێتـەوە. هەزارو چوار سەد ساڵ لەمەو پێش خـوا لـە تاقـە ئایـەتێکی قورئانا قومـاری لەگەڵ عەرەقا حـەرام کـردووە ئەفـەرموێ: (یا أیها الذین امنوا انما الخمر والمیسر والأنصاب والأزلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه لعلکم تفلحون) *واتـە ئـەی ئەوکەسانەی کە بڕواتان هێناوە عەرەق و، قومارو، بت پەرستی و، تیری گرەوکردن -کە لە پێش ئیسلامابوون- کـارێکی پیسـن لـە کـردەوەی شەیتانن، خۆتانی لێبپارێزن تـا لـەڕۆژی دوایـی ڕزگارتـان ببـێ* (إنما یرید الشیطان أن یوقع بینکم العداوة والبغضاء فی الخمر والمیسر ویصدکم عن ذکر الله وعن الصلاة فهل انتم منتهون) *واتـە شـەیتان هیچی مەبەست نیـیە ئـەوە نـەبێ کـە دوژمنایەتی وکینە بخاتە ناوتانەوە بەهۆی عەرەق و قومـارەوە. وە لـە یادی خوا و لەنوێژکردنتان بکات. ئایا دەست هەڵ ئـەگرن؟* واتـە بەسـە ئیتر دەست هەڵ گرن.

بەڕاستی وەک خوا ئەفـەرموێ عـەرەق و قومـار مایـەی شـەڕو ئـاژاوەو عاجزییە. زۆرجار دووکـەس یـا زیـاتر دائەنیشـن لەسـەر یـاری قومـار. لـە پـڕ لەسەر شتێک ئەبێت بەسوێند خواردن و تەلاق خواردن و جەنگ و ئـاژاوە. تـا وای لێ دێ ئادەمیی ئەفرەت لەخۆی ئەکات.

ئەی برای موسڵمان قومار هەزاران هەزار خانەدانی وێران کردووە. هەزاران هەزار دەوڵـەت و دارایی لـەناوبردووە. هـەزاران هـەزار دەوڵەمـەندی ڕیسـوا و ڕەجاڵ وە دووچاری بەلا و چورتمی کردووە.

قومار کشتگە (مزرعة)ی شەیتانە، ئەوی بەقومار دەوڵەمەند بێت هـەژارە. چونکە ئەگەر لە دەستێکا بیباتەوە. لە دەسـتی دووهـەما ئـەیدۆڕێنێ. بـەڵکو خۆی تیا نابوت ئەکات و سەری خۆی تیادائەنێ.

یـەکێک کـە فـێری قومـار بـوو ئـیتر نـاتوانێ خـۆی بگرێتـەوە. چونکـە یـا بردوویەتی‌یـەوە یـا دۆڕاندویـەتی ئـەوی بردوویەتی‌یـەوە بەتـەمای زیـاترە کـە بیباتەوە. وە ئـەوی دۆڕاندویـەتی. ئەیـەوێ حـەقی خـۆی بکاتـەوە لەبەرئـەوە هیچیان ناتوانن دەستی لێهەڵگرن.

برای موسلمان خوا قوماری حەرام کردووە، چونکە مایەی سەرومالە، زۆر دەولەمەندی قورس بوون لەیارییەکا هیچی نەماوە. وەهەژارکەوتووە، وەلەوەوە دوژمنایەتی پەیدابووە. وەسەرو مالی تیا چووە.

شتێکی تر هەیە لە قومارا کە زۆر خراپە. ئەویش ئەوەیە کە قومارچی فێری مالی هەوانتە ئەبێت. کە بە هەناسەیەک کومەلە پارە بباتەوە. دوای ئەوە ئیتر کەسابەتی پێناکرێ.

هەر ئەو قومارەیە کەخوا حەرامی کردووە (بطاقەی یانەصیب) کرین، (بطاقە) کرین لەهەر چوار مەزهەبەکەدا حەرامە. ئەوبطاقەیەی کە پول و پارەی لە گیرفانی زۆر کەسا نەهێشتووە، ئەو بطاقەیەیە کە بەدرێژایی سال ئەیکرن و هیچیان بۆ دەرناچێ، خەم و خەفەت نەبێ.

زۆر کەسی وا هەیە لیێ بووە بە نەخۆشی. خۆی و مال ومنالی رەجال و هەژار، کەچی هەموو جارێک بطاقەیەک یادوو یا سێ ئەکرێ. ئنجا تو خوا پارەی ئەو بطاقانەی کە سالەهای سال ئەیاندۆرێنێ کۆی بکردایەتەوە بۆ خۆی و منالەکانی باشتر نییە.

ئەی برای موسلمان لەخوا بترسە، قومار مەکە. بطاقەی یانصیب مەکرە، (کسب) و کار بکە و رووبکە خوا، (کاسب) خۆشەویستی خوایە، خوا نەیکردووە بە دەستور. رزق و رۆزیی ببارێنی بەسەر بەندەی خۆیا. خوا بەهانەی ئەوێ بۆرزق و رۆزی ناردن بۆ بەندەی خوا. تو دوکانێک دابنێ رووبکەرە خوا. یا بەکارێکەوە خەریک بە. خوا رزقت بۆ ئەنێرێ، ئنجا کەم یان زۆر، واتا هەولی زۆر بدەیت رزقی زۆرت بۆئەنێرێ. هەولی کەم بدەیت کەمت بۆ ئەنێرێ. خوا خۆی ئەفەرموێ (وان ليس للانسان الاماسعى) ***واتە هەرچی ئادەمی بە هەول و تەقەلای خۆی پەیدای نەکات دەستی ناکەوێ.***

ساخوا بەکەرەم و میهرەبانی خۆی رەحممان پێبکات، وەهۆش و گوشێکمان بداتێ کە بەپێی دەستور و باوی قورئان هەلسورێین، وە لە ئادابی قورئان دەرنەچین.



# دەستە بەری کۆمەڵایەتی

**ئەی موسڵمانینە !**

ئەبی بزانین کە دینەکەمان دینێکی عالەمیە. دینــی یـەکیتی وبرایەتی‌یـە. دینی (محبـة)ر خۆشەویستی‌یە دینـی راستـی ودروستی‌یە. دینـی لیبـوردن و چاوپۆشی‌یە. دینی ئاشتی و دوستایەتی‌یە. دینی دەستگرتن و یارمەتی‌یە.

یارمـەتی و دەسـت گرتنـی یـەکتریی خویـەکی زۆرجــوان و بـەرزە. خــوا هـەوەک لـەناو ئـادەمی دا دروسـتی کـردووە. لـە نـاو گیـان لەبـەرانی تریشـدا دروستی کردووە. وەک مێرولە و هەنگ کەیارمەتی یەکتری ئەدەن. وەئیشیان هەمووی هەر بەیارمەتی یەکتری‌یە. چونکە بـەبێ ئـەو یارمەتی‌یـە نـە ئـادەمی ئەژی و نـە گیـان لەبـەرانی تـر. ئـەو مێرولەیـە ئـەوەندەی بچـوک و زەبوونـە. ئەوەندەش ئیشکەرە. ئـەو شـارە مێرولەیـەی کـە ملیۆنێـک مێروولـەی تیایـە. هەموو وەک یەک هەوڵ ئەدەن و هەڵ ئەسورێن. وەهــەموو لایـەکیان یارمـەتی هەموو لایەکیان ئەدەن. وەبەهــەموویان زەخـیرەی زسـتانەکەیان ئەخـەن. بـۆ ئـەو رۆژە بەفروبارانانـەی کـە نـاتوانن لـە کـون بێنـە دەرەوە. هـەروا ئەگــەر مەترسی یەک رووی تێکردن. هەموو کۆ ئەبنەوە، وە هەوڵ ئەدەن بۆ لابردنـی ئەو مەترسی‌یە.

قورئانی پیرۆز لەسورەی (نمل) دا بۆمان ئەگێرێتەوە کە حەزرەتی سلێمان پێغەمبەر (بەخۆی و لەشکرێکی گەورەوە بە چۆڵێکا ئەڕوات کە پڕ ئەبێت لـە شارە مێروولە. وەسلێمان و لەشکرەکەی ئاگایان لەو مێرولانە نابێت کەوا لــەو شـوێنەدا بڵاوبوونەتــەوە. بــەڵام شــای مێرولــەکان هەســت بەمــە دەکــات. وەبەزمانی خۆیان بە مێرولـەکان رائەگەیـەنێ کـە ئاگاتـان لـەخۆتان بێـت، وە بچنە نـاو شـارەکانتان، تـا سلێمان و لەشـکرەکەی پێتـان پیانـەنێن و داتـان نەشێلن. قورئان ئەفەرموێت: (حتى اذا أتوا على وادي النمل قالت نملة يا ايها النمل ادخلوا مساكنكم لا يحطمنكم سليمان وجنوده وهم لايشعرون) *واتە کاتێک کە سلێمان بـە خـۆی و لەشـکرەکەیەوە گەیشـتنە دەشـتی مێرولـەکان. شــای مێروولەکان بانگی لێکردن و پێ ی وتن: ئەی مێرولەکان هەموو بچنـەوە ناو شارەکانتان تا سلێمان و لەشکرەکەی داتان نەشێلن.*

تەماشای مەردی ئەو مێرولەیە بکەن بزانن چۆن کە مەترسـی ڕووی کـردە هاورێکانی. خێرا بێداری کردنەوە و خەبەرەکەی پێدان.

ئـەم مێرولەیـە کـە ئـەم ئیشـە جوانـەی کـرد. خـوای گـەورە کردەوەکـەی پەسند کرد. وەلە قورئانی پیرۆزدا ناوی ئەو مێروولەیەی برد. وەسورەتێکی

لـه قورئـان بـەناوی ئـەو مێرووڵەیـەوە ناونـا کـە سـوورەی (نمـل)ە وەحیکایەتەکەی بۆ گێراینـەوە تـا ئێمەش چاو لـەو مێرووڵەیـە بکـەین. وە کردەوە جوانەکەی بکەین بەسەر مەشقی خۆمان. بەم ڕەنگـە نـاوی کـەس بـە خراپە نەبـەین. وەبـە دەسـت و زبـان زیـان لـە کـەس نـەدەین. وەهـەر چـەند ویستمان زیـان بـە یـەکێک بگەیـەنین. حکایـەتی ئـەم مێرولەیـەمان بـیر بکەوێتـەوە. وەشـەرم بمـان گـرێ وە پەشـیمان بینـەوە. ئـەگینا خـوا حکایـەتخوانی ئێمە نیـە حکایـەتی حـەزرەتی سـلێمان و مێرووڵـەمان بـۆ بگێڕێتـەوە. بـەڵکو مەبەستی خوا ئەوەیـە کـە ئێمەش وەک مێرووڵـە وابـین قازانجی یەکترمان بوێ، وەزەرەرو زیان لەیەک دوور بخەینەوە.

لە ئایەتێکی ترا خوا ئەفەرموێ: (المؤمنون والمؤمنات بعضهم اولياء بعض) *واتـە پیاوان و ژنانی موسڵمان یەکتری بۆ یەکتری یارمەتی دەرن.* واتە ئـەبێت هەموو موسڵمانێک خێرو خۆشی هەموو موسڵمانێکی بوێت. وە هیـچ کەسێک زیان بە هیچ کەسێک نەگەیەنێت، بـەڵکو ئـەبێ خزمـەتی یـەکتری بکـەین. بـە ماڵ، بەپارە، بە دەست، بە زبان، بە قەڵەم، لەگەڵ دراوسـێدا، لەگـەڵ خزمـا، لەگەڵ دۆست و برادەرا، لەگەڵ ناسیاوا، بەڵکو لەگەڵ هەموو کەسێکا.

بەم پێیە ئیسلام ڕازی نیە لەموسڵمانێک کە زەرەری موسـڵمانێکی بوێت توشی زەرەرو زیان، یا ئازار و سزای بکات.

ئیسلام ڕازی نیە لە موسڵمانێک کە خۆی تێر بێت ودراوسێکەی برسی بـێ و بێ شێو سەر بنێتەوە، ئەم برسی بێت وەئـەویش بـە دەوریـی و بـە لەگـەن چێشت بکاتە تەنەکەی خۆڵەوە.

ئیسلام ڕازی نیـیە لە موسڵمانێک بە بوخچە وبە باووڵ جلوبەرگی تـازە و کۆنی ببێت و هەژارەکەش لۆسەرمانا هەڵ لەرزێت هیچی نەبێت لەبەری کات.

ئیسلام ڕازی نیـیە لە موسڵمانێک کوتاڵ و زەخیرە و دەغڵ و دانـی زۆری ببێت وە هەڵیگرێت بۆ گرانتر. لە کاتێکا کە خەڵقی پێویست بن بەو شـتانەی کە ئەو هەیەتی پێغەمبەر (ئەفەرموێت (بئس العبد المحتكر إن أرخص الله الأسعار حزن وإن أغلاها فرح) *واتـە ئەوانـەی کـە کووتـاڵ و زەخـیرەو دەغـڵ و دان و ئەشارنەوە. بەندەیەکی زۆرخراپن. ئەگەر خوا، شت هەرزان بکات ئـەوان خەمبار بن. وە ئەگەر گرانی بکات ئەوان کەیف خۆش بن.*

ئیسلام ڕازی نیـیە لە موسـڵمانێک زەوی و زاری زۆری ببێـت بـە ڕەنگێـک خـۆی هـەمووی پـێ زەرع نـەکرێت. وە هێندێکـی بـە یـاریی بمێنێتـەوە. وەزارعەکانی دراوسێشی بێ ئەرزو ئاو بن.

یارمـەتی و دەستەبەرێتی کۆمەلایـەتی لـە ئیسـلاما گەیشـت بـە پلەیـەک حەزرەتی عومەر (ڕۆژێک لە (مدینە) جولەکەیەکی پیری ڕەجاڵی دیـی لەبەر دەرگایـان سـواڵی ئـەکرد. شـەو چـوو بـۆ مـاڵی ئـەو جولەکەیـە. وەهـەندێک

شتیشی لەگەڵ خۆیا برد. لە پاشا ناردی بە شوێن مأمووری خەزێنەدا. وە پێی وت: تەماشای ئەم جوولەکەیە و ئەمونەی ئەم بکە. ڕەوا نییە ئەمانە تا گەنج بوون و کەسب و کاریان دەکرد ئێمە سەرانەمان لێ ئەسەندن. ئێستا کە پیر بوون لێیان ئەپرسینەوە. وە فەرمانیدا فەرمووی لە ئەمرو بەدواوە سەرانەیان لێ مەسێنن. وە لەخەزێنەی دەوڵەت بەخێویان بکەن و وە مانگانەیان بۆ ببڕنەوە.

ئەی موسڵمانینە! موسڵمانی بەڕاستی بن. کە بەیەک گەیشتن سەلام لە یەک و هاتوچۆی یەک بکەن. بەخۆشی وناخۆشی یەکەوەبن. دەستی یەک بگرن. یارمەتی یەک بدەن. حەسوودی مەبەن. قین لە سک مەبن. ناوی یەکتری بەخراپە مەبەن. دڵتان لەگەڵ یەکا پاک بێت. دڵ پیس مەبن. قورئان ئەفەرموێت: (یوم لاینفع مال ولا بنون. الا من اتی الله بقلب سلیم) *واتە ڕۆژی دوایی ڕۆژێکە ماڵ و منال و دەوڵەت و دارایی کەڵک ناگرن. ئەوەی کەڵک بگرێت لەو ڕۆژەدا هەردڵی پاک وە کردەوەی چاکە.* ساخوا بە کەرەم و میهرەبانی خۆی دڵمان پاک بکاتەوە لەعاستی یەکتری، وەیارمەتیمان بدات لەسەر هەموو چاکەو دەست گیرییەکی موسڵمانان. وەلە هەموو بەڵایەکی ئەرزوئاسمان بمان پارێزێ.



# مانگی ڕەمەزان

**ئەی موسڵمانینە !**

خوا لەقورئاندا ئەفەرموێ (وربك يخلق مايشاء ويختار) *واتە خوا چی بوێ دروستی ئەکات، وە چیشی بوێ لەناو ئەم دروستکراوانەدا هەڵیئەبژێریو بەرزی ئەکات، وە چیشی بوێ لەناو ئەم دروست کراوانەدا هەڵی ئەبژێرێ و بەرزی ئەکاتەوە*، بۆم ڕەنگە یەکێک لەناو هەزاران کەسا هەڵ ئەخات بە زاناو خوێندنەوارێکی بەرز، یابەسەرکردەو قارەمانێکی بەهرەمەند، یابەپێغەمبەرو ڕەوانەکراوێکی گەورە و بڵندو پایە بەرز.

هەروەها کە لەگەڵ ویستی بەهرەی خۆی برێژێ بەسەر شوێنێکا، ئەو شوێنە هەڵ ئەبژێرێ لەناو هەزاران شوێنا، وە ئەیکات بە جێی طواف بۆ عالەم، وە شەوو ڕۆژی سەد هەزاران کەس بەدەوریا ئەخولێنەوە.

هەر بەو ڕەنگە کە لەگەڵ ویستی کاتێک پیرۆز بکات و بەرزی بکاتەوە بەسەر هەمووکاتێکا، هەڵی ئەبژێرێ و ئەیکات بەکاتی جۆرە خواپەرستی‌یەک. وە دەرگای ڕەحمەتی خۆی تیائەکاتەوە، وەک مانگی ڕەمەزان، کە کردوویەتی بە کاتی ناردنە خوارەوەی قورئان، ئینجا با بزانین قورئان چی‌یە ؟!

قورئان ئەو کتێبە پیرۆزەیە کە پەردەی لەسەر عەقلی ئادەمی لابرد، و لە بت پەرستی‌یەوە هێنایە سەر خواپەرستی.

قورئان ئەو کتێبەیە کە تەوق و پەیوەندی تقلیدو چاولێکەریی لە دەست و قاچ و ملی ئادەمی داکەند، وە پاڵی پێوەنا بۆ وورد بوونەوە لە ئاسمان و زەوی و دۆزینەوەی ئەسراری طبیعەت وەک خوا ئەفەرموێ (أو لم ينظروا في ملكوت السموات والأرض وما خلق الله من شيء).

قورئان ئەو کتێبەیە کە فەرق و فروقی هەڵگرت لەناوەندی ئادەمی‌دا. وە تێی گەیاندن کە هەموو لە ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە. وە کەس لە کەس زیاتر نی‌یە، بە پارێزگاریی و خواپەرستی نەبێ وەک قورئان ئەفەرموێ (ان اكرمكم عند الله اتقاكم).

قورئان ئەو کتێبەیە کە هەرچی ڕێی چاکە هەیە نیشانی ئادەمی ئەدات، وە هەرچی ڕێی خراپە هەیە لێی ئەگرێ.

ئینجا توخوا قورئانێکی وا گەورە، حەق نی‌یە ئەو مانگەی کە ئەو قورئانە تیاهاتۆتە خوارەوە بکرێ بە مانگی ڕۆژوو کە گەورەترین عبادەتو

خواپەرستی‌یە، وەیادی ئەومیهرەبانی‌یانەی تیا بکرێتەوە کە خوا لەگەڵ کۆمەڵی ئادەمی‌دا کرد، یەتی؟.

ئەی موسڵمانینە! یەکێک ئەبێ بە پاشا، یا بە سەر کۆمار تا ئەو پاشایە یا ئەو سەر کۆمارە بمینێ هەموو ساڵێک ڕۆژی لە دایک بوونی ئەکرێ بە شایی. وە لە هەرچی پایتەختی جیهانا هەیە نوێنەری ئەو پاشایە یا ئەو سەر کۆمارە ئاهەنگی تیائەگرن و شایی تیا ئەکەن. چونکە ئینسانێکی تیا لە دایک بووە.

یاخو دەوڵەتێکی،زیندوو هەموو ساڵێ لەو ڕۆژەدا کە دەستوری دەوڵەتەکەی تیا دانراوە ئەیکەن بەشایی بۆ دانانی ئەو دەستورە.

ئەی ئەو مانگی ڕەمەزانەی کە دەستوری ئیسلامی تیا هاتۆتە خوارەوە کە قورئانە، وەبەردی بناغەی ئاینی ئیسلامی تیا دانراوە، وەدەرگای خۆشی و خۆش بەختی تیا کراوەتەوە -لەکۆمەڵی ئادەمی- ئایا حەق نی‌یە ڕۆژووی ئەو مانگە بکرێ بە شایی لە دایک بوونی دەستوری ئیسلام کە قورئانە، کە دواترینی هەموو دینێک و هەموو شەریعەتێک و هەموو دەستورێکی ئاسمانی‌یە.

لەبەر ئەوە خوا خۆی مانگی ڕەمەزانی بەرزکردەوە، نەخشەی بۆ کێشاین کە چۆن ڕێزی بگرین، وەچ خوا پەرستی‌یەکی تیابکەین، وە ڕۆژووی ئەم مانگە پیرۆزەی دانا لەسەر موسڵمانان، وە فەرمووی (فمن شهد منکم الشهر فلیصمه) *واتە هەر کەسێ بەمانگی ڕەمەزان گەیشت با بە ڕۆژوو بێ* لە شوکرانەی ئەو قورئانە گەورەیەی کە بۆی نێراوە لەم مانگەدا، وە ئەم دینە پاکەی کەبۆی دانراوە، وە ئەم دەستورە جوانانەی بۆی هاتووە. کەواتە ئەی موسڵمانینە بچن بە پیر مانگی ڕەمەزانەوە، بەڕەنگێکی وا کە خوا و پێغەمبەر پێیان خۆش بێ. وەپێشوازی‌یەکی وای بکەن کە لایەقی ئەم مانگە و شایستەی قورئانی پیرۆزبێ، وەتا ئەتوانن بە گژ کەسا مەچن و دڵی کەسی تیا ئازار مەدەن و ناوی کەسی بە خراپە تیا مەبەن و ئامۆژگاریی ماڵ و منداڵتانی تیا بکەن بە نوێژ و ڕۆژوو، چاوتان لە دراوسێی هەژارو هەتیوی بێ کەس و پیری کەفتەکاری بێ نەوابێ.

سا خواش یارمەتی‌مان بدات بۆ پێشوازی مانگی ڕەمەزان، وە نوێژ و ڕۆژۆکەمان گیرا بکات، وەبمان پارێزێ لەهەموو بەلاو چورتمێکی ڕۆژگار.



# فەلسەفەی ڕۆژوو

**ئەی موسڵمانینە !**

خوا لە ساڵی دووهەمی کۆچی. وەلەبەشی دوایی مانگی شەعبانا ڕۆژووی ڕەمەزانی فەرزکرد. وەئایەتی (کتب علیکم الصیام کما کتب علی الذین من قبلکم لعلکم تتقون) ی ناردە خوارەوە. *واتە ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە. ڕۆژووتان لەسەر پێویست کرا. هەروەک پێویست کراوە لەسەر گەلانی پێش ئێوە. تا لەخوا بترسن، وەلەترسی خوا خۆتان بپارێزن لەهەموو گوفتار و کردارێکی خراپ.*

لەخوا ترسان سەرچاوەی هەموو چاکەیەکە. وەک پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ (راس الحکمة مخافة الله) کە لە خوا ترسان بوو، هەموو چاکەیەک چاوەڕوان ئەکرێ، کە لە خوا ترسان بوو، پارێزی لە هەموو خراپەیەک ئەکرێ.

لەخوا ترسان کەبوو نە چاو گوناه ئەکات. نەدەست گوناه ئەکات. نەزبان گوناه ئەکات. نەقاچ گوناه ئەکات، وەلەشکری ئەندام بەدەست و چاوو زبان و گوێ وقاچەوە، هیچیان لەفەرمانی خوا دەرناچن. وەئیشی بێ شەرعی ناکەن. کەلەخوا ترسانیش نەبوو، ئەم ئەندامانە هەموو لە پەت بەر ئەبن. ئەو حەلە چاوە تەماشای ناموسی خەڵک ئەکات بەناپاکی. دەستە دەست درێژی ئەکات. دەم و زبانە ناوی خەڵق ئەبات بەخراپە. قاچە ئەچێ بۆ گوناهو ئیشی بێ شەرعی. کەواتە ڕۆژوو باشترین ( مدرسە )یە بۆ موسڵمانان کە دەرسی لە خوا ترسانی تیا بخوێنێ. وەفێری لەخوا ترسان ببێ. چونکە کەس ئاگای لە ڕۆژوو نی یە خوانەبێ. وەهەموو کەسێک لەهەموو خواپەرستی‌یەکا. ئەتوانێ ریایی تیا بکات، لە ڕۆژوودا نەبێ. چونکە هەموو کەس ئەتوانێ بە دیمەن بەڕۆژووبێ بەدزیی‌یەوە بیشکێنێ. کەلە ترسی خوا نەیشکاند ئەوە مەعنای وایە کە ئەو ڕۆژووە هەر بۆ خوایە. بۆیە خواش لە حەدیسێکی قودسی دا ئەفەرموێ (کل عمل ابن آدم له إلا الصوم فانه لي، وانا أجزی به) *واتە هەموو چاکە و خوا پەرستی یەکی ئادەمی بۆ خۆیەتی. تەنیا ڕۆژوو نەبێ، کەئەوە هەر بۆ منە. وە هەر خۆم پاداشتی ڕۆژووان ئەدەمەوە.* ئینجا هەر کەسێک بەڕۆژووبوو نەخوازەڵا لەهاوینانا. کەڕۆژگار درێژو گەرمە. لەبەیانی‌یەوە وە تائێواری. زۆرجار ئەو ڕۆژووانە ئارەزووی خواردن و خواردنەوە ئەکات. وەلەگەڵ هەموو جارێکا، خوای بیرئەکەوێتەوە. وەلەترسی خوا لەو ئارەزوودی ئەگەڕێتەوە. وەبەم ڕەنگە ڕیشەی لەخواترسان. لەدڵودەروونیا ئەڕوێ وجێگیر ئەبێ. وە هەمیشە وائەزانی کە لەبەردەمی خوادا وێستاوە.

ئەگەر ئەمیش چاوی لە خواوە نەبێ. بڕوای وایە کەخوا چاوی لەمە و هەرچی بکات ئاگای لێیە.

لەخوا ترسان کەگەیشتە ئەم پایەیە. ئیتر ئینسان نەبەکردار و نەبەگوفتار کارێکی واناکات کەخوا پێیناخۆش بێ. تەنانەت گەر بەبێ دەسەڵاتی خۆی شتێکی خراپ بەدڵیا هات -خێرا لەترسی خوا- تەوبە ئەکات. وەئەو بیرە خراپە لەدڵی خۆی دەرئەکات.

توخوا ڕۆژووانێکی تینو. یابرسی کە بەتەنیا لەشوێنێکی چۆڵا. ئەوێری لەترسی خوا قومێ ئاو. یاپاروویەک نان بخوات. چۆن ئەوێرێ ماڵی یەکێک بخوات. یافێڵی لێ بکات. یاسوێندی درۆ بخوات. یاشەهادەتی درۆبدات. یابەچاوی ناپاکی تەماشای ناموسی یەکێک بکات.

کەواتە فەلسەفەی ڕۆژوو. ئەم ترس و پارێزگارییەیە. کەخوا ئیشارەتی بۆکردوو فەرمووی (لعلکم تتقون) هەر موسڵمانێک کە گەیشتە ئەم پایەیە. هەموو کردەوەیەکی بەبەرئەبێ. وەهەر کەسێکیش نەی گەیشتێ. هەموو کردەوەیەکی بەبا ئەچێ. بەڵێ هەموو خواپەرستییەک مایەی لەخواترسانە. بەڵام هیچیان ناگەن بەڕۆژوو.

کەواتە ڕۆژووی ڕەمەزان. گەورەترین بۆتەیە بۆ موسڵمان. لە یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانەوە لەم بۆتەیەدا قاڵ ئەبن. تاڕۆژی جەژن. ئەو حەلە ئینجا وەک پارچە زێڕێکی پاکی بێ خەوش. پاک ئەبنەوە تاساڵێکی تر.

بەڵێ فەلسەفەی ڕۆژوو ئەمەبوو کە قورئان بەیەک (کلمە) باسی کردووە فەرمووی (لعلکم تتقون) بەڵام لەگەڵ ئەم فەلسەفەیەدا. گەلێ فەلسەفەی تریشی هەیە. وەک ئەمانەی دوایی:-

*١- موسڵمان بەهۆی ڕۆژووەوە. فێرئەبێ کە لغاوی هەوەس وە ئارەزووی خۆی بگرێتەوە. وەزاڵ ببێ بەسەر خۆیا. وەهەر دەمێ ئارەزوو بردی بۆکارێکی بێ شەرعی بتوانێ بەئاسانی خۆی لێ بگێرێتەوە.*

*٢- ڕۆژوو ئادەمی دڵ نەرم ئەکات. وەفێری بەزەیی هاتنەوەی ئەکات بەهەژار و کەم دەستانا.*

*٣- لەڕۆژووی ڕەمەزانا یەکسانی هەیە لەناوەندی دەوڵەمەندو هەژارو گەورە و بچووکدا. چونکە هەموو وەک یەک برسی وتینوون.*

*٤- ڕۆژووی ڕەمەزان کۆمەڵە و گەڵ فێری دەستووری نان خواردن ئەکات. بەم ڕەنگە هەموو لەیەک کاتا پارشێو ئەکەن. وەلەیەک کاتا ڕۆژوو ئەشکێنن.*

*٥- ڕۆژوو ئەگەر بە پێی ئامۆژگاری ئایین و فەلسەفەی دین بێ. ئەبێ بۆ ریازەت و کەم خواردن بێ، نەک بۆ زۆر خواردن، ئەو حەلە ئینسان لاواز ئەبێ. وەهەرچی بەزو چەوریی -کە لەلەشیا چین چین کەوتۆتە سەر یەک، وەتەنگی بەدڵ هەڵچنییوە- هەمووی ئەتوێتەوە. هەر لەبەر ئەوەیە کەپێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ (صوموا تصحوا) واتە بەڕۆژووبن تا ساغ و تەندروست بن.*

بەلام داخەکەم ڕۆژووی ئێستا، لەجیاتی ئەوەی قازانجی ببێ هەندێ جار زەرەری هەیە، چونکە یەکەم، هەرچی خواردنی قورس وقەڵەو هەیە، هەمووی ئەخرێتە مانگی ڕەمەزانان. دووهەم بۆ ڕۆژووی دەدوانزە سەعات. کەس لەکاتی بەربانگدا ئاگای لەخۆی نامێنێ، وەبەهەڵپەوە ئەچنە سەر نانخواردن ئەڵێی سەد ساڵە هیچیان نەخواردووە، نەخوازەلا پارشێوان. کەئەمەندە ئەخۆن، دوای ماوەیەکی کەم، لەتینوانا گریان تێ بەر ئەبێت وە لە نیوەڕوانا ئەڵێن: ئاخۆ بگەینە ئێواری تێر ئاو بخۆینەوە، ئینجا هی وا هەیە لەکاتی بەربانگا -ئەوەندە ئاوی سارد ئەخواتەوە- چاوی تاریک ئەبێ یا توشی نەخۆشی ئەبێ، هیچ ڕەمەزانێک نییە بەهۆی زۆر خواردنەوە، چەند کەسێکی تیا نەخۆش نەکەوێ یانەمرێ. لەمانە هەمووی ناشیرین تر بۆ ڕۆژووان، تورەبوونەکەیانە. لایان وایە کەلەگەڵ بەڕۆژوبوون، ئەبێ تورە ببن، وە هەر لەخۆیانەوە بچن بەگژ ئەم و ئەوا. نازانن کەڕۆژوو بۆ ئەوە دانراوە کە ئینسان لەخوا نزیک بکەوێتەوە، وەڕەوشت وخووی فریشتە و پێغەمبەران بگرێ. وەتێناگات کە بە سەد ڕۆژوو گوناهی توورەبوونێکی بێجێ ناسرێتەوە.

کەواتە ئەی موسڵمانینە لەمانگی ڕەمەزانا زیادەخۆری مەکەن. زبانتان شیرین و ناوچەوانتان ڕوون و دڵتان پاکو دەمتان پاک وە دەستان کراوەبێ لەگەڵ هەژاران و لێ قەوماوانا، وە ڕەحم بەموسڵمانان بکەن. تاخواش ڕەحم بەئێوە بکات وە دەستی موسڵمانان بگرن. تا خواش لەکاتی تەنگانەدا دەستان بگرێ وەبێ بەدەنگتانەوە. خوا ڕەحممان پێ بکات. وە بەهیدایەتی قورئان هیدایەتمان بات..



# ڕەمەزان و.. ئەو شتانەی کە بیرمان ئەخاتەوە

**ئەی موسڵمانینە !**

هەموو شتێک جۆرە ئیحایەکی هەیە یەعنی کە لەگەڵ دیت. یابیستت شتێک بەدڵتا تێ‌ئەپەڕێ، ئینجا بابزانین ئیحای ڕەمەزان چییە. وەلەعەصری پیغەمبەرا ﷺ چی تیا ڕوویداوە، وە لەگەڵ ڕەمەزانت بیر کەوتەوە. چی ترت بیر ئەکەوێتەوە. ئەو شتە گەورەو گرنگانەی کە لە مانگی ڕەمەزانا ڕوویانداوە لەکاتی پێغەمبەرا سێ شتن، کەلەگەڵ ڕەمەزانت بیر کەوتەوە، ئەوانەشت بیر ئەکەوێتەوە.

**یەکەمیان:**

قورئانی گەورە و پیرۆز، کە لە مانگی ڕەمەزانا هاتۆتە خوارەوە. وە یەکەمین وەحی تیا هاتووە بۆ پێغەمبەرﷺ. وە بەردی بناغەی ئیسلامەتی تیا دانراوە. وەک خوا ئەفەرموێ (شهر رمضان الذي انزل فيه القران، هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان)

**دووهەم:**

لە حەقدەی مانگی ڕەمەزان -کە ڕۆژی جمعە، وەلە ساڵی دووهەمی هیجری دابوو- یەکەمین غەزای ئیسلامی تیا قەوماوە. کە پێی ئەڵێن: غەزای بەدری گەورە. وە لەشکری حەق و ناحەق دایان بە یەکا. وە لەشکری ناحەق لەبەردەمی لەشکری حەقا شکاو ڕووخاو تلیسایەوە. کە بەم غەزایە ئیسلامەتی -وەک درەختێک کە بنێژرێ‌و بگیرسێ- ڕوواو گیرساو ڕیشەی داکوتا. وە پێغەمبەرﷺ و موسڵمانەکان یەکەمین جارە کە خۆیان بنوێنن. وەنرخ و قیمەتیان بچێتە دڵی دوژمنەکانیانەوە واتا لەمانگی ڕەمەزانا -کەقورئانی تیا هاتۆتە خوارەوە- درەختی ئیسلامەتی تیا نێژرا، وەلەدوای پانزە ساڵ -کەجەنگی بەدری تیا قەوما- ئەو درەختە گیرساو جێگیر بوو. کەواتە ئەم دوو ڕووداوە زۆر گرنگن، وەپەیوەندییان هەیە بەیەکەوە. بۆیە قورئانیش لەیەک ئایەتا ناویان ئەبات وکۆیان ئەکاتەوە. ئەفەرموێ (ان كنتم امنتم بالله وماانزلنا على عبدنا يوم الفرقان، يوم التقى الجمعان) *واتا ئەگەر بڕواتان هەیە بەخواو بەوەی کەناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان (محمد) لەڕۆژی (ناردنی) قورئانا. ئەو ڕۆژەی کە دوو لەشکر دایان بەیەکا (لەبەدردا).*

لەبەر گرنگی ئەم جەنگە. خوا منەت ئەنی بەسەر پێغەمبەرو موسڵمانانا کە بە لەشکرێکی (٣٠٥) کەسییەوە خوا زاڵی کردن بەسەر لەشکرێکی ٩٥٠کەسیدا. وە حەفتایان لی کوشتن -کەیەکێکیان ئەبو جەهل بوو- وەحەفتاوشەش کەسیان لێ بەدیل گرتن. وەئەفەرموێ (ولقد نصركم الله ببدر وأنتم أذلة فاتقوا الله لعلكم تشكرون) *واتا بەڕاستی خوا یارمەتی‌دان لە(غەزای) بەدرا لەکاتێکا کەئێوە (لەهەموو ڕوویەکەوە) زەبوون بوون. ئێنجا لەخوا بترسن تاشوکرانەی خوا بکەن.*

**سێهەم:**

لەو شتە گرنگانەی کەلەمانگی ڕەمەزانا ڕووی داوە فەتحی مەککەیە. کەلەساڵی هەشتەم. وەلەمانگی ڕەمەزانا پێغەمبەرﷺ بەخۆی و دەهەزار صحابە وە چووە سەر(مەککە). وەلەڕۆژی جومعە و بیستەمی مانگی ڕەمەزاندا مەککەی گرت. وەکەعبەی پاکردەوە لەو بتانەی کە تیابوو.

کەواتە درەختی ئیسلامەتی لەمانگی ڕەمەزان ولەشەوی (ليلة القدر)دا نێژرا. وەلەحەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووهەمی کۆچی کە غەزای بەدری تیاکرا. ئەو درختە گیرساو ڕوواو پەلوپۆی دەرکرد. وە لە ڕەمەزانی ساڵی هەشتەما کە مەککە گیرا. ئەو درەختە گەورە بوو. وە سێبەری کرد لەهەموو عەرەبستان. ئیتر دەستە دەستە خەڵق ئەهاتن وموسڵمان ئەبوون. وەک سوورەی (انا فتحنا لك فتحا مبينا) ئیشارەتی بۆ ئەکات.

موسڵمان هەرچەند بەمانگی ڕەمەزان بگات ئەم ڕووداوانەی بیر ئەکەوێتەوە. وەئیمانی موسڵمان بەیادی ئەو سەرچاوانە تازەدەبێتەوە.

ئەمە مانگی ڕەمەزان بوو. وەئەمانە ئەو شتانە بوون کە لە ڕەمەزانا بەبیرا دێن. کەواتە شایستەیە بۆموسڵمانان کەدڵیان بکەنەوە بۆ مانگی ڕەمەزان. وەبۆ ئەو شتانەی کەلەمانگی ڕەمەزانا ڕوویداوە لەئیسلامەتی‌دا. وەدڵی خۆیان سپیل بکەن. وەهەر ژەنگێکی پێوە بێ لێی‌بکەنەوە. وە ڕێی خەیاڵ و خەتەری شەیتان ببەستن لەدڵی خۆیان.

مانگی ڕەمەزان تۆمارێکی مێژوویی‌یە بۆ ئەو بەسەر هاتە گەورانەی کەتیا ڕوویداوە هەر وەک دەفتەرێکی خوایی‌یە ناوی ڕۆژووان و ئەو کردەوە چاکانەی تیا ئەنووسرێ کەلەڕەمەزانا ئەیکەن. لەئاخر شەوی مانگی ڕەمەزانا ئەو دەفتەرە ئەپێچرێتەوە و مەڵ ئەگیرێ. ودبەرز ئەکرێتەوە بۆ بارەگای خوای گەورە وەک قورئان ئەفەرموێ (اليه يصعد الكلم الطيب والعمل الصالح يرفعه) *واتا هەموو قسەیەکی پاک و هەموو کردەوەیەکی چاک بۆ بارەگای خوای گەورە بەرز ئەبێتەوە.* لەبەیانی ڕۆژی جەژنا هەقی هەموو کەسێک ئەدرێ. وەهەموو ڕۆژووانێک پاداشتی خۆی و جائیزەی خۆی وەرئەگرێ بەزیادەوە. وەک قورئان ئەفەرموێ (انما يوفى الصابرون اجرهم بغير حساب).

کەواتە ئەی موسڵمانینە بچن بەپیر مانگی ڕەمەزانەوە بەجۆرێکی وا کەخواو پێغەمبەرﷺ پێیان خۆش بێ. وەپێشوازییەکی وای بکەن کە لایەقی ئەم مانگە و شایستەی قورئانی پیرۆزبێ. ئاگات لەدەست و دەمو دڵو زبانتان بێ. جنێو مەدەن. ناوی کەس بەخراپە مەبەن. دوو ڕوویی و دوو زبانی مەکەن. ماڵی کەس مەخۆن. قەرزی موسڵمانان بدەنەوە. دڵی کەس ئازار مەدەن، بەچاوی ناپاکی تەماشای کەس مەکەن. هەمیشە هاتوچۆی مزگەوت وجمعە وجەماعەت بکەن. تەراویحتان نەفەوتێ. گوێ لە وەعظ و ئامۆژگاری مزگەوتەکان بگرن. سا بەڵکو خوا ڕەحممان پێبکات لەم ڕەمەزانە پیرۆزەدا. وەلە ڕۆژی ڕەش و بەلای گەورە بمان پارێزی.



# خوا حافیزی لە ڕەمەزان

**ئەی موسڵمانینە !**

چەن حەفتەیەک لەمەو پێش مانگی ڕەمەزان هات بەخۆی و هەموو خێرو بەرەکەتێکی‌یەوە خەتیبەکان خوتبەی زۆر جوانیان تیاخوێندەوە لە ڕۆژی جومعانا، وەخوێندەواران و زانایانی ئایین زۆر باسی گەورەیی مانگی رەمەزان و خێروبەرەکەتی ڕۆژوویان بۆ کردین، وە وەعظو ئامۆژگاریی‌یان کردین، خاوەن قەڵەمەکان وتاریی زۆر جوانیان بۆ نووسین لەرۆژنامەکانا، وە لە رادیۆو تەلەفزیۆنا قورئانی زۆرمان بۆ خوێنرا، وە بەدوورو درێژیی باسی گەورەیی رەمەزان و شۆڕشی ئاسمانیان بۆ کردین، کە قورئان چۆن ئەو شۆڕشەی هێنایە سەر زەویی، وە پێشرەویی‌کرد تا دام و دەزگای بت و بت پەرستانی هەڵگرت، وە بازاڕی زۆر و ستەم و ناحەقی پێچایەوە، وە بۆ شوکرانەی ئەم شۆڕشە، خوا ڕۆژووی ئەم مانگەی دانا لەسەر موسڵمانان، وە ئەمانە بەهەموو لایەکیان لەماوەی ئەم مانگەدا ناوچەیەکی گیانی‌و جەوێکی ڕۆحی وایان بۆ پێکهێنایین، چاوەڕوان ئەکرا کە هەموو موسڵمانێک بەژن و پیاو و گەورە و بچووکەوە بەڕۆژووبن، وە هەموو دەست بدەنە خواپەرستی، وەلە کاری بەد و خراپی خۆیان بگێڕنەوە،بەڵام بەداخەوەئەم هەموو قورئان خوێندنە، وە ئەم هەموو ئامۆژگاریی و حەدیس خوێندنەوەیە، وە ئەم هەموو خوتبە جوانانەی کە درا بە گوێچکەدا، کاری نەکردە هەموان، بەڵکو هەر کاری کردە سەر کەمێک لە موسڵمانان کە بەڕۆژوو بوون و هاتوچۆی مزگەوت ئەکەن.

ئەی برای موسڵمان! ئەم مانگە پیرۆزە واخەریکە بارئەکاو بەجێمان دێڵێ، وەچیمان تیا کردووە لەچاکەو خراپە ئەیبا بۆبارەگای خوا و ڕای ئەنوێنێ، وەشەهادەت ئەدا لەمەحکەمەی خوادا بە چاکە لە سەر چاکان وە بە خراپە لە سەر خراپان، ئینجا خۆزگە بەو کەسانەی کە بە ڕووسووری مانگی رەمەزانیان گرت، وەخواو پێغەمبەریان لەخۆیان خۆشنوود کرد، خەجاڵەتیش بۆئەو کەسانەی کەخواو پێغەمبەریان لەخۆیان ڕەنجاند، وەحورمەتی ڕەمەزانیان شکاند.

ئەی برای موسڵمان! زۆری وامان هەیە هەر لەمانگی ڕەمەزانانا نوێژ ئەکەن و بەڕۆژوو ئەبن، وەهاتوچۆی جومعەو جەماعەت ومزگەوت ئەکەن، وەک خواپەرستی هەر بۆ مانگی ڕەمەزان دانرابێ وایە، نازانن کە عیبادەت هەر بۆ خوایە، وە فەرقی مانگی ڕەمەزان و شەوال لای خوا نی‌یە.

ئەی برای موسڵمان !خوا بە پێغەمبەر و هەموو موسڵمانێک ئەفەرموێ. (واعبد ربك حتى ياتيك اليقين) *یەعنی نوێژ و خواپەرستی بکە تا مردن* پێغەمبەرﷺ لەو نەخوشی‌یەی کەتیا وەفاتی فەرمووە نوێژی نەچووە. ئینجا تەماشاکەن پێغەمبەرێکی وا گەورە لە کاتی گیانەڵا وا ئاگای لەنوێژەکانی بێ. وە یەک نوێژی نەچێ. چۆن ئەبێ موسڵمان لەساڵێکا یانزە مانگ نوێژ نەکا. ڕەمەزان و ڕەمەزان نەبێ.

ئەی برای موسڵمان! ئێوە لەمانگێکی زۆر گەورە و پیرۆزان. ئەوانەی کەعاجزیان بووە. با ئاشتیان بێتەوە، ئەوانەی کە ڕقیان لەیەکە. بادڵی خۆیان پاک بکەنەوە لەقین و کینە. ئەوانەی هاتووچۆی یەک ناکەن با دەست بکەنەوە ملی یەک. ئەوانی حەسادەت بەیەک ئەبەن. باتێ بگەن کە ئەو نیعمەت و دارایی‌یە خوا ئەیدا، وە کەس بەزۆری بازووی خۆی پەیدای نەکردووە وەنایکات. کەواتە ئەو کەسە گوناهی چی‌یە کەخوا دەوڵەمەندی کردووە. خوا لە قورئانا بەوانەی کەحەسادەت بەموسڵمانان ئەبەن ئەفەرموێ (ام يحسدون الناس على ما آتاهم الله من فضله) ***واتە بۆ حەسادەت ئەبەن بەمردوم لەسەر ئەو لطف و میهرەبانی‌یەی کەخوا ڕشتویەتی‌ی بەسەر بەندەکانی خۆیا*** . واتە حەسادەت بە کەس مەبەن. وەچاو بە کەس هەڵمەهێنن. لەخوا ئەپاڕێمەوە بە لطف و میهرەبانی خۆی لێمان خۆش بێ. وە ڕۆژووی ڕەمەزانەکەمان لێ قبوڵ بکات. وە هەموو ڕەمەزانێکمان بەخۆشی بێت و بڕوا وە اصلاحی حاڵمان بکات، وەدڵمان پاک بکاتەوە لەژەنگی گوناە وە لەهەموو بەلا و چورتمێکی ڕۆژگار بمانپارێزێ. وە دەرگای ئەمن و ئاسایش و خۆشی و خۆشبەختی‌مان لێ بکاتەوە.



# تەوبە و پەشیمانی!

**ئەی موسڵمانینە !**

ئەم مانگی ڕەمەزانە شۆڕشێکی ایمان وباوەڕ خواپەرستی خستە ناو موسڵمانانەوە، زۆر کەس لەوانەی کەنوێژیان نەئەکرد، یا عەرەقیان ئەخواردەوە و قوماریان ئەکرد، بە بەرەکەتی مانگی ڕەمەزانەوە تەوبەیان کردو دەستیان هەڵ گرت، هەروەک دەستیان کرد بەنوێژو ڕۆژوو، بە ڕۆژ بەڕۆژوو بوون و بەشەو لەتەراویحا بوون، وە خۆیان بەسابوونی تەوبە و پەشیمانی پاک، وەنامەی ڕەشی ئەعمالیان بە فرمێسکی پەشیمانی شۆرییە و سپی‌یان کردەوە، ئیمانی خۆیان تازە کردەوە، لطف و میهرەبانی خوا و پێغەمبەرﷺ و موسڵمانانیان بۆ خۆیان ڕاکێشا، وەهاتنەوە ڕیزی موسڵمانان و خواپەرستان، زۆر حەیفە کە لەمەولا تەوبەکەیان بشکێنن، وە بگەڕێنەوە سەر کردەوە ناشرینەکانی جارانیان، ئەی ئەو کەسانەی کە لە مانگی ڕەمەزانا تەوبەتان کردووە، ئەگەر عبادەتتان بۆ مانگی ڕەمەزان کردووە، ئەوا مانگی ڕەمەزان تەواو بوو، وەپشتی هەڵ کرد و ڕۆی، وە ئەگەر عیبادەتیشتان بۆ خوا کردووە، خوا باقی‌یەو لەشوێنی خۆیەتی، وە لە ڕەگی بنا گوێ لێمان نزیک ترە، چاوی لەهەموو کردەوەیەکمانە وە گوێی لەهەموو قسەیەکمانە وەئاگای لەهەموو خەیاڵێکمانە، کە بە دڵمانا بێت و بڕوا، ئەی موسڵمانینە ! تەوبە کردن عومری ئینسان تازە ئەکاتەوە، تەوبە کردن بەهاری عومر و زیندەگانی‌یە، لەبەر ئەوە قورئان لە (١١٥) شوێنا ناوی تەوبە ئەبات، وەهانەهانەی موسڵمانی لەسەر ئەدات، بەم ڕەنگە لەئایەتێکا ئەفەرموێ: (یاأیها الذین آمنوا توبوا الی الله توبة نصوحاً) *واتە ئەی موسڵمانینە تەوبە بکەن بەتەوبەی خالص.*

لەئایەتێکی ترا ئەفەرموێ (وهو الذي يقبل التوبة عن عباده ويعفو عن السيئات) *واتە خوا ئەو خوایەیە کەتەوبە لەبەندەی خۆی قبول ئەکات، وە لە هەموو گوناهێکی خۆش ئەبێ.*

لەئایەتێکی ترا ئەفەرموێ: (الا من تاب وآمن وعمل عملا صالحا فاولئك يبدل الله سيئاتهم حسنات وكان الله غفورا رحيما) *واتە ئەوانەی کەخاوەنی ئیمان و باوەڕ وکردەوەی باشن، وە لەگەڵ هەموو گوناهێکا پەشیمان ئەبنەوە و تەوبە ئەکەن، خوا تەوبەیان لێ گیرا ئەکات، وە هەر بەوەش دەست هەڵناگرێ بەڵکو هەرچی خراپە وگوناهێکیشیان هەیە بۆیان*

وەرنەگنیرێ بەچاکە. هەر بەم ڕەنگە لە (١١٥) شوێنا ناوی تەوبە ئەبات. وەداوا لە موسڵمانان ئەکات کە لەگەڵ هەموو گوناهێکا تەوبە بکەن و پەشیمان بنەوە.

پێغەمبەریش ئەفەرموێ (كل أبن آدم خطاء، و خير الخطائين التوابون) *واتە هەموو ئادەمیی‌یەک غەڵەت ئەکات بەزۆری، وەباشترینی گوناهباران و هەڵەکەران ئەوانەن کە لەگەڵ هەڵەیەکا تەوبە ئەکەن.*

لەفەرموودەیەکی ترا پێغەمبەر (ئەفەرموێ (ياايها الناس توبوا الى الله واستغفروه فأني اتوب اليه في اليوم مائة مرة) *واتە ئەی خەڵقینە تەوبە بکەن و پەشیمان بنەوە داوای لێخۆش بوون بکەن لەخوا، من بەش بەحاڵی خۆم ڕۆژی سەد جار تەوبە ئەکەم.*

ئینجا لەلایەک پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و خاتەمی انبیاء لە هەموو شەو و ڕۆژێکا سەد جار (محتاج) بێ بە تەوبەکردن لەگوناە، کەهەرچی گوناهێکیش بێ نەی بووە، ئەی ئێمەی گوناهبار چۆن ئەبێ تەوبە نەکەین!.

ئەی موسڵمانینە ئەمڕۆ -کەدنیایە- کردەوە هەیە و پرسینەوە ومحاسەبە نی‌یە. سبەینێ کەڕۆژی قیامەتە- محاسەبە هەیە وە کردەوە نی‌یە، کەواتە فرسەتە تا دەرگای تەوبەمان لێ دانەخراوە با لەهەموو کردەوەیەکی خراپی خۆمان پەشیمان ببینەوە، وەبەڕاستی ڕووبکەینە خوا.

ئەی موسڵمانینە ! هەرکەسێک بێتە سەر گوناهێک کە بیکات، تاخەڵق چاوی تێوە بێ گوناهەکە ناکات. کاتێک ئەیکات کە کەس چاوی تێوە نەبێ. ئەی ئەو کەسە نازانێ کەخوا چاوی لەهەموو شتێکەوەیە و ئاگای لێیەتی، ئەی نابێ ئەوەندەی شەرم لە ئینسانێکی بێدەسەڵات ئەکات. ئەوەندەش شەرم لەخوابکات.

ئەی موسڵمانینە ڕەحمەتی خواتان لێ بێ ئەم تەوبەیەی کەلەم ڕەمەزانەدا کردوومانە بانەیشکێنین. وەئەم ڕۆژوو نوێژەی کەدەستمان داوەتێ بادەستی لێ هەڵ نەگرین. وەئەم پاکبوونەوەیەی کەلەم مانگەدا دەستمان کەوتووە باچڵکنی نەکەینەوە.

سا خوا بە کەرەم و میهرەبانی خۆی تەوبەمان لێ گیرا بکات وە یارمەتیمان بدات بۆ هەمو گوفتار و کردارێکی باش.



# دەردی توڕەیی

**ئەی موسڵمانینە !**

لەهەموو سیفەتێک جوانتر بۆ ئادەمیی سیفەتی حیلم ولەسەر خۆییە. لەهەموو سیفەتێک ناشرینتر سیفەتی تووڕەیی وهەڵچوونە. حیلم سیفەتی خوایە. لەپانزە شوێن لە قورئانا خوا سیفەتی حیلم ناو ئەبا. هەر کەسێک جلەو بۆ تووڕەبوونی خۆی شلکا وەک هەشدیهایەک وایەکە لەماڵی خۆیا بەرەڵای بکا یابەرمیلێک باروت لەژووری نوستنیا دابنێ لەلای سەریەوە، کەلەهەموو کاتێکی بیمی تەقینی لێ ئەکرێ، کە سەرو ماڵی تیا بچێ.

ئەی برای موسڵمان تووڕەیی جۆرێکە لەشێتی، ئەوانەی کەتوڕەو کەللەشەقن کەس خۆشی ناوێن، هەزار چاکەیان بێ کەس ناوی نابا، کەس نایەوێ لەگەڵیانا دانیشێ، یاقسەیان لەگەڵ بکا. یابییان بینێ، بەڵکو هەموو کەسێک لێیان دوور ئەکەوێتەوە. تەنانەت ژنەکەی خۆی ومناڵەکانی لێی ئەترسن، لەکاتێکا کە ئەو لەماڵەوە بێ کەس ناوێرێ قسە بکا یا پێ بکەنێ.

پیاوی تووڕە کە لەگەڵ تووڕە ئەبێ. ئاگای لەخۆی نامێنێ، وەک جانەوەرێکی درندەی لێ دێ. زۆر جار لەو حەلانەدا لەسەر قسەیەکی هیچ وپووچ ماڵی خۆی وێران ئەکاو ژنەکەی تەلاق ئەدا و مناڵەکانی ئاوارەو پەرەوازە ئەکا. وەخۆی سەر گەردان، یاتووشی بەندیخانە ئەبێ.

جالەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هەموو کەسێک کە بە هەموو هێز و دەسەڵاتی خۆیەوە هەوڵ بدات بۆچارەکردنی ئەم دەردە کوشندە. وەئەم نەخۆشییە کاریگەرە.

ئەگێڕنەوە ئەڵێن یەکێک چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ و پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگارییەکم بکە کەسووک و ئاسان بێ وتێی بگەم، پێغەمبەریش فەرمووی ( لاتغضب) واتا توڕە مەبە.

کابرا چەند جار پرسیارەکەی لەپێغەمبەر کردەوە. هەموو جارێ پێغەمبەر ﷺ پێی ئەفەرموو (لاتغضب) ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرﷺ ئەزانن یەعنی چی؟ یەعنی ئەی کابرا تۆ بەڵێن بە من بدە کە هەرگیز توڕە نەبیت. منیش بەڵێن بەتۆ ئەدەم بەهەموو خێرو چاکەیەک.

توڕەیی پەردە بەسەر چاوو، گوێ، دڵو، وەدەروون و، ژیریی، وەبیرا ئەهێنێ. وەسەر لەمردووم تێک ئەدات، تا ئەیخاتە چاڵێکەوە کەلێی دەرنەچێ. لەبەر ئەوە زانایانو دانایان ئەڵێن: توڕەیی وەک عەرەق وایە. یەعنی چۆن عەرەق خورایەوە ژیریی و لێکدانەوە ناهێڵێ، وەئەبێ بە کلیلی

دەرگای هەموو خراپەیەک. تورەییش وایە. واتە هەردووکیان وەک غوولی بیابان عەقڵ و مەعریفەتی ئادەمی ئەفرێنن. لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ (ليس الشديد بالصرعة وانما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب) *واتە پیاوی بەهێز ئەوە نییە کەلەزۆران بازیی دا سەرکەوێ. وەهەرچی بێتە ڕێی تەختی ئەکات. بەڵکو بەهێز کەسێکە کەلەکاتی تورە بوونیا. دەرەقەتی نەفسی خۆی بێ. وەئەو ڕق و تورەبوونەی قووت بداتەوە.*

قورئان تورەیی کردووە بەڕەوشت و خووی بێبڕوایان. وەناوی ئەبا بە (حمیەتی جاهلی) وەهێواشی ولەسەرخۆیی ونەرم وشلیشی کردووە بە ڕەوشت و خووی پێغەمبەرﷺ و موسڵمانانن. وەناوی ئەبا بە (سکینە) وە لەسەر خۆیی. ئەفەرموێ: (اذ جعل الذين كفروا في قلوبهم الحمية حمية الجاهلية، فانزل الله سكينته على رسوله وعلى المؤمنين).

(امامی علی) ئەفەرموێ: تورەیی جۆرێکە لەشێتی. چونکە خاوەنەکەی دوای تورەبوونەکەی یاپەشیمان ئەبێتەوە یا پەشیمان نابێتەوە. ئەگەر پەشیمان بووەوە، ئەوە مەعنای وایە کەتورەبوونەکەی لەجێی خۆیا نەبووە، بۆیە پەشیمان بۆتەوە. وەئەگەر پەشیمانیش نەبووەوە، ئەوە مەعنای وایە کەشێتێتییەکەی زۆر قایم و بەهێزە وە کابرا شێتێکی پەتەڕی ماڵ وێرانە. مێژوو باس ئەکات کەزۆر پیاوی گەورەی بەجەوهەری زانای دانای بەبەهرە بوون لەناو مەردووما، چونکە تورەو تڕۆبوون، وەنەیان توانییوە چارەی تورەیی خۆیان بکەن، یا دایپۆشن. لەبەر ئەوە لەبەر چاوکەوتوون. بەڵکو زۆر جار بەتورەیی خۆیان ئەو پرۆژەو مەشروعانەی کە ساڵەهای ساڵ لەگەڵیا خەریک بوون تا دایانمەزراندووە. کەچی بەتورەبوونێک ڕووخاندوویانە یان تێکیان داوە. مێژوو ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ: پیاوێک جنێوی‌دا بە(شەعبی) ئەمیش ووتی: ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەیت لەم جنێوانەدا خوا لەمن خۆش بێ، وەئەگەر درۆش ئەکەیت خوا لەتۆ خۆش بێ. هەروا جارێکیان حەزرەتی عیسا بەلای چەند جوولەکەیەکا تێپەڕی، جوولەکەکان قسەی خراپیان پێ وت. ئەمیش قسەی باشی پێوتن. هاوڕێکانی عیسا پێیان ووت: ئەوان قسەی خراپ بەتۆ ئەڵێن و تۆ قسەی باشیان پێ ئەڵێیت. حەزرەتی عیسا فەرمووی: هەرکەس گوێز لەباری خۆی ئەژمێرێ.

(ئەنەسی کوڕی مالک) ئەفەرموێ: حەوت ساڵ پێش خزمەتی پێغەمبەرﷺ بووم. لەم ماوەیەدا پێغەمبەرﷺ جارێک پێی نەووتم بۆچی ئەم ئیشەت کرد یا بۆچی نەتکرد.

ئەی برای موسڵمان ! توورەیی یەکێکە لەنەخۆشییە پیسەکان کە چارەی زۆر گرانە دکتۆری دڵان پێغەمبەری ئیسلامﷺ. دەرمانی بۆ داناوە ئەفەرموێ (اذا غضب احدكم فليسكت) *لەگەڵ یەکێکتان تورە بوو. با بێدەنگ*

بىن. *تاتورەیی‌یەکەی بەسەرئەچێ*. ئەگینا دەم بەدەم کەڵەپەتری زلتر ئەکات. وەئاگرەکە خۆشتر ئەکات تا خۆی ئەسووتێنێ.

هەر بەو ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی تریا ئەفەرموێ (الا ان الغضب جمرة توقد في جوف ابن آدم، فاذا وجد احدكم شيئاً من ذلك فالارض الأرض) *واتا تورەیی پشکۆ ئاگرێکە هەڵ ئەگیرسێ لەدەروونی ئادەمی دا. ئینجا کەلەگەڵ زانیتان واتورەبوون. بەشتێکی ترەوە خۆتان خەریک بکەن، تا تورەیی یەکەتان بەسەر ئەچێ.بەم ڕەنگە ئەگەر بەپێوەن، دانیشن، وەئەگەر دانیشتوون هەستنە پێ یان، یابڕۆنو دەست نوێژێک بشۆن بەئاوێکی سارد، وەدووركات نوێژ بکەن لەخوا داوا ئەکەین ئەخلاقمان جوان بکات. وەلەهەموو نەنگ وعەیب و عارێک بمان پارێزێ.*



# دوو زبانی

**ئەی موسڵمانینە !**

هەمو گوناهێک جۆرە خۆشی‌یەکی تیا هەیە دووزبانی نەبێ، کەهەرچی خۆشی بێ تیایانی‌یە، لەبەرئەوە دووزبانی پیشەی پیاوی نامەردە، پیشەی ئەو کەسانەیە کەحەزیان لەئاژاوە و ناکۆکی موسڵمانانە، حەزیان لەعاجزی باوکە لەگەڵ کوڕ و، برایە لەگەڵ برا و، ژنە لەگەڵ مێردی، دراوسێ‌یە لەگەڵ دراوسێ، ئاشنایە لەگەڵ ئاشنا و هاوڕێ‌یە لەگەڵ هاوڕێدا. خوای گەورە خۆشەویستی و ( محبە )تی واجب کردووە لەناو موسڵمانانا، وە گێراوێتی بەنیشانەی ئیمانو باوەڕیان، موسڵمان ئەگەر ووردبێتەوە تێ ئەگات کەنوێژو جومعەو جەماعەت مایەی کۆبوونەوەی موسڵمانان و یەکتری ناسین و پەیدابوونی خۆشەویستی و ( محبە )تە. پارە بەشینەوەی دەوڵەمەند بەناوی زەکاتەوە، مایەی خۆشەویستی‌یە لەناوەندی دەوڵەمەندو هەژارانا. ڕۆژووی ڕەمەزان مایەی نزیک بوونەوەی دەوڵەمەند و هەژارە لەبرسێتی وتینوێتی دا، حەج مایەی نزیک کەوتنەوەی موسڵمانانی جیهانە لەیەکتری وەپەیدابوونی دۆستی وخۆشەویستیانە.

شیعاری ئیسلام سەلام کردنە لەیەکتری، بۆ ئەوەی کە کەس لەگەڵ کەسا عاجزیی وزویریی نەمێنی، بەڵام بەداخەوە لەناو موسڵمانانا، موسڵمانی وامان هەیە، بەوەکەیف خۆشە کە برا بکا بەگژ براداو، دۆست لە دۆست بڕەنجێنێ و ئاگری دوژمنایەتی لەناویانا هەڵگیرسێنێ و قسەی ئەم ببا بۆ ئەو و قسەی ئەو بێنی بۆ ئەم، وەقسەبگێڕێتەوە بەڕاست یا بەدرۆ، هەر بۆتێک دانی بەینی دوو کەس کەساڵەهای ساڵە دۆست وئاشنای یەکن، وەبۆ هەڵگیرساندنی ئاگری ناکۆکی و دووژمنایەتی.

ئەی موسڵمانینە ـ!ـ بەهۆی فیتنەو فەسادو دووزبانی‌یەوە، تائێستا، هەزاران هەزار خێزان ڕوخاوەو خوێن ڕژاوە و برا کوژراوەو ژن تەلاق دراوە و کچی داوێن پاک بەخەنجەر پارچە پارچە کراوە ومأمور دەرکراوەو نانی براوە.

ئەی موسڵمانینە ـ! دووزمانی ئیشی نامەردانە، پیشەی درۆزنانە، نیشانەی ناپاکی ناپاکانە دروشم ( شعار ) ی گوناهکاران و لەخوا نەترسانە. موسڵمان ئەگەر لەدینی خۆی بگاو لەقورئانەکەی حاڵی ببێ، گوێ بۆ دووزبان ناگرێ، وەئەدا بەدەمی ئەوانەی کە دێنەلای بۆ دووزبانی.

ئەی ئەو کەسەی کەناوی خۆت ناوە موسڵمان، تۆ ڕەوای ئەبینی بەخۆت، کەببیت بەجێ نشینی ئەلخەنناس، کەخوا سوورەتێکی لەقورئان ناردۆتە

خـوارەوە هـەربۆ پـەنا گرتـن بـەخوا لەشـەڕی ئـەو کەسـانەی کەبـەدووزبانی خۆیان، وەسوەسەو دەغدەغە ئەخەنە دڵی موسـڵمانانەوە، وەئەفـەرموێ (قل اعوذ برب الناس. ملك الناس. اله الناس. من شر الوسواس الخناس) *واتـە پـەنا ئـەگرم بەخوا لەوەسوەسەی وەسوەسەداران* (الذي يوسوس في صدور الناس) *ئـەوەی کەوەسوەسە ئەخاتە دڵی مەرڤومەوە* (من الجنة والناس) *لەجن ولەئادەمی.*

خوا بمان پارێزی لەم پیشە پیسـە، وەبمـان پـارێزی لەشـەڕی دوو زبـانی بوختان کەران.



# جاران ئاوابوون

**ئەی موسڵمانینە !**

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکیا بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێ: زۆر لەپێش ئێمەدا پیاوێک پارچەیەک زەوی ئەکرێ لەپیاوێکی تر کەبیکا بەخانوو، کەبناغەی خانووەکە هەڵئەداتەوە کوپەڵەیەکی پڕ لەئاڵتوون ئەدۆزێتەوە، بێ ئەوەی کەس پێ بزانێ، کابرا کوپەڵەکە ئەباتەماڵەوە، وەلەدڵی خۆیا ئەڵێ، خاوەنی ئەم ئەرزە نەی زانیوە کەئەم کوپەڵەیە لەم ئەرزەدایە، وەئەو هەر ئەرزەکەی بەمن فرۆشتووە، ئەگەر بیزانیایە کەئەم کوپەڵەیەی تیایە بۆخۆی دەری ئەهێنا، وەئەرزەکەی بەکوپەڵەکەوە نەئەفرۆشت، کابرا خێرا هەڵ ئەستێ ئەچێ بۆلای خاوەنی ئەرزەکە، وەحیکایەتەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە، وەکوپەڵەکەی بەئاڵتوونەکەوە لەبەردەمیا دائەنێ و ئەڵێ: ئەمە ماڵی تۆیە.

کابرا خاوەن ئەرزیش ئەڵێ: کاکە من ئەرزەکەم بەتۆ فرۆشتووە بەخۆی و هەرچییەکی تیایە، لەبەر ئەوە ئەم کوپەڵەیە ماڵی من نی یە بەڵکو ماڵی خۆتە عافیێت بێ، هەردوولا هەرچەند ئەکەن ناتوانن یەکتری اقناع بکەن، ئەمیان ئەڵێ: من هەر زەویم لە تۆ کڕیوە، کوپەڵە ئاڵتونم نەکڕیوە، ئەویشیان ئەڵێ: من زەوییەکەم بەتۆ فرۆشتووە بەخۆی و هەرچییەکی تیایە، بەم ڕەنگە کوپەڵە ئاڵتوونەکە لە ناوەندی هەردووکیانا ئەمێنێتەوە، نە ئەم خۆی ئەکا بە ساحێبی و نە ئەو، بەڵکو ئەم لەخۆی دوور ئەخاتەوە بۆئەو و، ئەو لەخۆی دوورئەخاتەوە بۆ ئەم تا لە پاشا ئەچن بۆلای زانایەکی بەرز، وەداستانەکەی بۆ ئەگێڕنەوە، وەهەر یەکێکیان بەدڵ ئەیەوێ کەحوکمەکەی بۆ ئەویکەی تریان بدرێ، کابرای زانا تێ ئەگات کە ئەم دووانە هیچ کامێکیان ئەو کوپەڵەیەی ناوێ، چونکە بەماڵی خۆی نازانێ لە پاشا لێیان ئەپرسێ: ئایە ئێوە مناڵتان هەیە؟ یەکێکیان ئەڵێ: من کوڕێکم هەیە ئەوەی کەی تریشیان ئەڵێ: منیش کچێکم هەیە، کابرای زانا ئەڵێ کەواتە ئەم کوڕو کچە لەیەک مارە بکەن وەبەم پارەیە خانوویەکیان بۆبکڕن لەگەڵ ناوماڵا، وەپارەکەیان بۆ خەرج بکەن، وەشتێکیشی لێبکەن بەخێر تا خوا بەرەکەتیان تێبخات، وەبەم شێوە جوانە موحاکەمەکە تەواو ئەبێ.

ئینجا تەماشای ئەم ئەخلاقە بەرزوجوانە، وەئەم ڕەوشتە پاکو تەمیزە بکەن، کڕیارێک ئەمەندە ئەمین بێ، کوپەڵەیەکی پڕ لەزێڕ بدۆزێتەوە لە ئەرزێکدا غەیری خۆی و خوا نەبێ کەسی تر ئاگای لێ نەبێت، کەچی لەبەردەست پاکی ئەمانەتی خۆی بچێ خەبەر بدات بە خاوەنی پێشووی

ئەرزەکە وە کوپەڵە زێرەکە لەبەردەمیا دابنێ، وەپێی بڵێ من ئەمەم لەتۆ نەکڕیوە، لەبەر ئەوە ئەمە ماڵی من نییە، ماڵی تۆیە. کڕیاریش لەبەر حورمەتی کڕین و فرۆشتنەکە کوپەڵە ئاڵتوونەکە وەرنەگرێ، وە بڵێ: من ئەرزم بەتۆ فرۆشتووە بەخۆی و هەرچێکی تیایە، وەئێستا ئەمە ماڵی تۆیە و ماڵی من نییە.

ئەمە ئەو سەر گوزشتەیە کە پێغەمبەر ﷺ زۆر بەکورتی بۆی گێڕاوینەتەوە تا نیشانمان بدات کەپیاوی باشی جاران چۆن بوون وەکڕین و فرۆتنیان چۆن بە سەر ڕاستی بووە، وەئێمەش ئێستا چۆنین، وەکڕینو فرۆتنمان چۆنە.

بچۆرە مەحکەمە بپرسە ساڵی چەند هەزار دەعوا ئەکرێ؟ زۆریان دەعوای درۆو ناڕاست، وەشاهیدەکانی هەمووی بەپارە گیراون، وە شەهادەتیان درۆو، سوێند یان درۆو، دەعوایان درۆیە.

زۆرترینی ئیش وکاری ئەمڕۆ بناغەی لەسەر درۆو، دەلەسەو، فروفێڵ و، حیلەو حەواڵە و، دەسیسەیە، هەردوولا ئەیانەوێ فێڵ لەیەکتری بکەن، وەیەکتری ئیخفال بکەن، وەپارەیەک بچڕن بەناحەق.

زۆر محاکەمەمان دیوە ساڵەهای ساڵ درێژەی سەندووە، زۆر جار (مدعی) و (مدعی علیە) مردوون. وەدەعوا دەور بۆتەوە بۆ کوڕو کوڕەزا، وەبەسەدەها جەلسەی لێ گیراوە پارێزەر (محامی)ی هەردوولاحازر بوون لەگەڵ شاهدا، وەبەسەدەها، بەڵکو بەهەزاران دینار خەرج کراوە لەو ڕێگایەدا، تا ناحەقێکیان سەپاندووە. هەزار ڕەحمەت لەپێشینانمان کەوتوویانە (دنیا بەدرۆو، قیامەت بەڕاست) خواڕەحممان پێ بکات، وەلەشا ڕێی ئیسلامەتی لامان نەدات.



# بەرپرسیاری هەموو کەسێک لە کۆمەڵەدا

**ئەی موسڵمانینە !**

پێغەمبەر ﷺ فەرموودەیەکی زۆر گەورەو گرنگ و پیرۆزی هەیە کەشایستەی ئەوەیە بەئاوی ئاڵتون بنوسرێتەوە، وەلەچوارچێوەی زیو بگیرێ، وەلەهەموو ماڵێک وەلەهەموو دائرەیەکا هەڵواسرێ تاهەمیشە لەبەرچاوبێ وەهەموو کەسێک بەپێی خۆی و مەرکەزی خۆی کەڵکی لێ وەرگرێ، حەدیسەکە ئەفەرمووێ (كلكم راع و كلكم مسئول عن رعيته) یەعنی *هەموو لایەکتان واجبێکی خێزانی یا کۆمەڵایەتی تان لەگەردنایە، وەهەموو یەکێکتان مەسئولە لەواجبی خۆی، کەئەبێ بەجێی بێنێ،* ئینجا پێغەمبەر خۆی تەفصیل ئەدات، وەلەپێش هەموو کەسێکا سەرۆکی دەوڵەت ئەکات بە(مسئول) ئەفەرموێ (الامام راع ومسئول عن رعيته) یەعنی *خەلیفەی وەخت یا پاشای وەخت چاودێری رەعیەتە. مسئولیەتی ئەو لەمسئولیەتی هەموو کەسێک گەورەترە،* بەم ڕەنگە سەرۆک (مسئولە) لەئستقراری ئەمن و ئاسایش و بلاوکردنەوەی هەرزانی و فەرحانی و ئاسان کردنی ڕێی ژیان و دۆزینەوەی ئیش و کار بۆ بێئیشان و بلاوکردنەوەی زانین زانیاری و، ساغی و تەندروستی و نەهێشتنی فەقیری و نەخۆشیو نەخوێندەواری و، دۆزینەوەی اهل بۆ وەزائفی حکومەت.

لەدوای سەرۆکی دەوڵەت ئینجا باسی سەرۆکی خێزان ئەکات ئەفەرموێ (والرجل راع في اهله وهو مسئول عن رعيته) *یەعنی پیاوی ماڵی چاودێری منالەکانێتی لەژن ولەکور لەکچ* و، بەم ڕەنگە ئەبێ بەخێویان بکات و، پێیان بخوێنێت و فێری واجباتی دینیيان بکات وەئاگای لەڕەوشت وخوویان بێ و نەیەڵێ بەرەڵلابن.

لەدوای باسی مسئولیەتی پیاو ئینجا باسی مسئولیەتی ژن ئەکات لەماڵی مێردیا ئەفەرموێ (والمرأة راعية في بيت زوجها ومسئولة عن رعيتها) یەعنی *ژن لەماڵی مێردیا چاودێری ماڵو منالێتی،* بەم ڕەنگە ئەبێ پاکو تەمیزی ڕایان گرێ. خواردن و کالایان پاک و، ڕەووشت و خوویان چاک بێ، تاببن بە ئەندامێکی بەکەڵک بۆ کۆمەڵە و گەلیان.

لەدوای مسئولیەتی پیاوو ژن ئینجا باسی مسئولیەتی خادم ئەکات ئەفەرموێ (والخادم راع في مال سيده ومسئول عن رعيته) *یەعنی خادم لەماڵی*

*گەورەی خۆیان چاودێری ئەومالەیە کەلەژێر دەستیایەتی نابێ دزیی وخیانەتی لێ بکات.*

مەبەست لەم خادمە هەر خزمەت کاری ماڵی نی‌یە بەڵکو هەرچی موظفین و مستخدەمینی حکومەتی هەیە هەموو خادمی حکوومەتن نابێ خیانەت لەماڵی حکوومەت بکەن، وەسستی لەواجبی خۆیان بکەن.

لەدوای باسی مسئولی‌یەتی ئەمانە ئینجا باسی مسئولی‌یەتی ئەولادی ماڵی ئەکات ئەفەرموێ (والولد راع في مال ابيه وهو مسئول عن رعيته) *ئەولادی ماڵێ لەدوای باوکی چاودێری ماڵەکەی باوکێتی، ئەبێ بەلاوی نەکاتەوە، وەلەبەردی نەدا، وەئاگای لەخێزانەکەی بێ نەیپووخێنێ، وەناووشۆرەتی وون نەکات.*

لەبەینی ئەم دەرەجاتەی کەپێغەمبەرﷺ بەکورتی ناوی بردن، زۆر دەرەجاتی تر ماوون بەم ڕەنگە هەموو وەزیرێک مەسئولە لەمحافظەکەی، هەموو قائمقامێک مسئولە لە قەضاکەی هەموو مدیرێکی ناحیە مەسئولە لە ناحیەکەی هەموو کوێخایەک مسئولە لەدێ‌یەکەی، هەموو مامۆستایەک مەسئولە لەقوتابخانەکەی، هەموو خاوەن معمل وکارگەیەک مەسئولە لەکاروباری معملەکەی، خولاسە هەموو بەپێی مەرکەزی خۆی مەسئولە لەو ئیشەی کەپێی سپێرراوە. ئینجا بەپێی ئەم (منهجە) پیرۆزەی کە پێغەمبەرﷺ دایناوە هەر لە سەرۆکی دەوڵەتەوە تا هەرچی فەڕاش و مستخدمین هەیە بە هەموو طبقاتی شعبە وە هەموو مربوطی یەکن، وە هەر یەکە واجبێکی خۆی هەیە لە گەردنیا کە ئەبێ بە جێی‌بێنێ خیانەتی تیانەکات، لە خوا ئەپاڕێمەوە کە تۆفیقمان بدات لە سەر ڕێی ئیسلامی‌یەت وە لە سەر بەجێ‌هێنانی واجباتی دینی.



# نەشەمە (تشائم)

**ئەی موسڵمانینە** لەپێش ئاینی ئیسلاما تەشاوم زۆر بووە لەناو ئادەمیدا، واتە زۆر شتیان بەشووم زانییوە، کوندەبەبوویەک بەسەربانی ماڵێک یابەسەر درەختی حەوشەیەکەوە بنیشتایەتەوە، ئەو ماڵە بەپیاوو بەژنەوە ئەشڵەژان وەختێ ئەچوون ئەو کوندەبەبۆیەیان هەڵئەفڕان. یا قەلەڕەشێک بەسەر ماڵێکا بفڕیایە و بیقڕانایە، ئەو ماڵە خەموخەفەت دای ئەگرت. یاهەر شتێک ژمارەی سیانزەی پێوە بووایە نەئەچوون بەلایا. هی وابووە یەکێکی بەشووم زانییوە، ئەگەر بچوایە بەدوای کارێکی گرنگی خۆیا، وەلەڕێگا بەو کابرا شوومە بگەیشتایە، لووسو بارێک ئەگەڕایەوە وەکارە گرنگەکەی خۆی بەجێئەهێشت، وە دەستی لێهەڵئەگرت، هەرژوورێک یاهەر خانوویەک ژمارەی سیانزی لێ بنوسرایە، نەئەچوونە ناوی، باجێگای تریشیان دەست نەکەوتایە. هی وا هەیە ئەگەرچاوێکی بفڕێ ئیتر نازانێ چیبکات وەخەمی دنیا دای ئەگرێ، دەمێک پووشێک تەڕ ئەکات و ئەینێ بەپێڵوی ئەو چاوەیەوە، دەمێک پارچەیەک کاغەزێکی پێوە ئەنێ، هی واهەیە ئەڵێ فلان ڕۆژم پێوە نایەت بۆ سەفەر کردن، ئەتوانم بڵێم هەر ماڵەی، ئەمانە هەمووی فروفێڵی شەیتانن ئەیەوێ ڕووی موسڵمانان لەخوا وەرگێڕێ وەشەریکو هاوبەشی بۆ پەیدا بکەن،، وەلەشەریکەکانی بترسن و لە خوا خۆی نەترسن، ئەگینا قەلەڕەشێک بەو ئاسمانەوە بقڕێنێ، یا کوندەبەبوویەک بەسەربانی ماڵێکەوە بنیشێتەوە، یاچاوێک بفڕێ ئەبێ چ نرخێکی ببێ لای موسڵمانی خاوەن بیروبڕوا، لەکاتێکا کە خوا ئەفەرموێ: (قل لن یصبنا الا ماکتب الله لنا هو مولانا وعلی الله فلیتوکل المؤمنون) *یەعنی ئەی پێغەمبەر بەموسڵمانانن بڵێ: هەرچی خوا لەچارەی ئەنووسی بین تووشمان نابێ، خوا گەورەو خاوەنمانە، بڕواداران لەهەموو کارێکیانا پشت هەر بەخوا ئەبەستن.*

کاتێک کەئیسلام هات بینی زۆر کەس تەشاوم ئەکەن وەهەر یەکە لەشتێک سڵ ئەکات، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لیس منا من تطیر) *واتە لەئوممەتی من نییە ئەو کەسەی تەشائم بکات، وەشتێک بەشووم و ئەگبەت بزانێ*، واتە موسڵمان ئەبێ هەر لەخوا بترسێ، وەهەموو خۆشیو ناخۆشییەکی خۆی هەر لەخواوە بزانێ، وەنابێ ئەم شتە هیچوپوچانە بەشەریکو هاوبەشی خوایان دابنێت بەم ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ بەرەبەرە ریشەی تەشاومی هەڵکەند لەدڵی موسڵمانانا، وەلەجێی ئەو تەشاومە، تەفائل بەخێری تیا ناشت، بەڵام بەداخەوە ئەم قراندن و تەشائومە ڕۆژ بە ڕۆژ لەناو موسڵمانانا بڵاو ئەبێتەوە، تەنانەت زۆر کەس لەمانگی قوربانا ژن

مارە ناکەن چونکە بەنەگبەت وشوومی ئەزانن، وەئەو کارە پیرۆزە بە خۆڕایی دوای ئەخەن، یان چەند کەسێک بەکارێکی خێرەوە خەریکن کە لەگەڵ یەکێکیان پژمی هەموو ئەڵێن ئەها جەختی هێنا، وەبەو بۆنەیەوە ئەو کارە خێرە بەجێ دێڵن. ئەمانە هیچیان ئەسڵو ئەساسیان نی‌یە لەئیسلاما، وەقورئان تەحاشایان لێ ئەکات.

هی واهەیە لەڕۆژی سێ شەموانا سەفەر ناکات ئەڵێ شوومە، بەلام ئەوە بزانێ کەهەموو ڕۆژێ ڕۆژی خوایە، وەهیچ ڕۆژی لەخۆیا شوومی نی‌یە، هەموو ڕۆژێک کەدێتو ئەڕوا پیرۆزە بۆ هەندێک و شوومە بۆ هێندێکی تر بەپێ‌ی ئەو کارەی کەتیا ئەکەن، کاری باشت تیا کرد خێرت دێتەڕێ وکاری خراپت تیا کرد خراپت دێتە ڕێ ئەگر ڕۆژێک شووم بێ ئەبێ ئەو ڕۆژە لەهەموو دنیادا بۆ هەموو کەسێک شووم بێ کەچی وانی‌یە. ڕۆژی واهەیە بۆ هەزاران کەس شومە وەبۆ هەزاران کەسیش خۆشی‌یە، کەوابوو خۆشی‌و شوومی هی ڕۆژەکە نی‌یە، بەڵکو هی کردەوەی ئینسانەکەیە.

خوا لەسوورەی یاسین دا بۆمان ئەگێڕێتەوە کەدووپێغەمبەری ناردووە بۆ سەر شاری انطاکیە کە ئیمان بێنن، لەپاشا پێغەمبەرێکی سێهەمیش بە دوایانا نارد، بەلام هیچیان ئیمانیان پێ‌نەهێنان، وەبەپێغەمبەرەکانیان ووت: (انا تطیرنا بکم) *واتە ئێمە تەشاومتان پێ ئەکەین، وەبەشوومتان ئەزانین* (لئن لم تنتهوا لنرجمنکم ولیمسنکم منا عذاب الیم) *ئەگەر دەست لەم ئامۆژگاریە هەڵ نەگرن بەردەبارانتان ئەکەین وەسزاتان ئەدەین* (قالوا طائرکم معکم ائن ذکرتم) *پێغەمبەرەکانیش پێیان ووتن خۆتان شوومن کەئیمان ناهێنن، وەخوا لەدوایی‌دا لەناوتان ئەبات بەهۆی شوومی خۆتانەوە، ئێمە هاتووین ڕێی ڕاستتان نیشان بدەین وەئامۆژگاریتان بکەین کەچی ئێوە تەشائوممان پێ ئەکەن وەهەڕەشەمان لێ ئەکەن ؟!!*

موسڵمان ئەبێ هەمیشە چاویلکەیەکی سپی لەچاوا بێ، وە دنیا بەسپی و ڕووناک ببینێ. موسڵمان چونکە سەرچاوەی دڵی بەئیمان ڕووناکە ئەبێ بۆ هەموو شتێک تەفاول بکات نەک بۆ خۆی بقرێنێ، بەلام ناموسڵمان بەهەموو شتێک تەشاوم ئەکات، وەبەقرەی قەلێک یادەنگی کوندەبەبوویەک یافڕینی چاوێک لەترسانا دائەچڵەکێ وەسەری لێ ئەشێوێ، ئەمە چۆن لەگەڵ ئیمان‌وباوەڕا کۆئەبێتەوە. موسڵمان ئەبێ هەمیشە پشتی بەخوا ئەستوورو دڵی بەخوا قایم بێ، وەبەهیچ شتێک لێڵ نەبێ‌و تێک نەچێ.

خوا بمان هێنێتەوە سەر ڕێ ی ئیسلامەتی، وەلەخرافات و شتی پڕو پووچ ڕزگارمان بکات.

# جۆرەكانى سوێند

**ئەی موسلمانینە**

سوێند خواردن لەناو موسڵمانانی ئەمڕۆدا ئێجگار زۆر بووە، بەڕەنگێکی وا ئەگەر لەسەر فلسێک سەد سوێند بخۆن باکیان نییە، لەکاتێکا کەزۆر لەموسڵمانانی پێشوو لەهەموو تەمەنی خۆیاندا سوێندێکیان نەخواردووە، نەبەڕاست و نەبەدرۆ بەڕاستی ئەمەی ئێستا زۆر بێ شەرمییە کەهەر ساتە نەساتێک لەسەر شتێکی هیچوپووچ سوێند ئەخورێ بەخوای گەورە، ئینجا لەبەر ئەوەی کەسوێند سێ جۆری هەیە بەپێویستم زانی باسێکی ئەم سوێندانەتان بۆبکەم تا لە حوکمەکانیان تێبگەن.

**جۆری یەکەم:**

سوێندێکە کەلەخۆیەوە بەسەر دەمابێ، بێ ئەوەی کەسوێندەکەت مەبەست بێ، بەم ڕەنگە بۆ شوێنێک ئەچیت، یەکێک ئەڵێ: ئەوە بۆ کوێ ئەچیت؟ تۆش ئەڵێیت: بەخوا بۆهیچ کوێ، لەکاتێکا کەبۆشوێنێکیش ئەچیت.

یاقسە لەگەڵ یەکێکا ئەکەیت یەکێکی تر ئەڵێ ئەوە ئەڵێیت چی؟ تۆش ئەڵێیت: بەخوا هیچ ناڵێم، لەکاتێکا کەقسەش ئەکەیت.

یادەمت ئەجووڵێت وەشتێک ئەخۆیت، یەکێک ئەڵێ ئەوە چی ئەخۆیت؟ تۆش ئەڵێت: بەخوا هیچ ناخۆم، لەکاتێکا کەشتێکیش ئەخۆیت. ئەم جۆرە سوێندانە لەشەرعا بێ نرخن. وە کەس لەسەریان گوناهبار نابێ.

هەر وەک ئەم سوێندانە وان سوێندی ڕێزو مجامەلە. بەم ڕەنگە خولقی یەکێک ئەکەیت کەتۆزێ دانیشێ لەلات، ئەویش دانانیشێ تۆش ئەڵێت: بەخوا دائەنیشیت، کەداشنانیشێ. یاخولقی خواردنی یەکێک ئەکەیت ئەویش ناخوات. تۆش ئەڵێت: بەخوا ئەخۆیت، کەناش خوات، یا یەکێک ئەڵێ: بەخوا ئەڕۆم کەناش ڕوات، یابەخوا ئیشم هەیە کەئیشیشی نییە.

ئەم جۆرە سوێندانەش خوا لەقورئانا ناویان ئەبات بەسوێندی (لغو)، واتە بێ مەبەست بەسەر دەما دێن، وەهیچ مەبەستێکی سوێندیان تیا نییە. وەکەس نایەوێ بەوسوێندە، ناحەقێک بکات بەحەق، یاحەقێک بکات بەناحەق، وەلەسەر ئەم جۆرە سوێندانە هیچ گوناهێکتان ناگات وەک خوا ئەفەرموێ (لایؤاخذکم الله باللغو في ایمانکم) *واتە خوا لەسەر سوێندێک ناتانگرێ کەهەربەدەم بێ و بەدڵ نەبێ* و(ولکن یؤاخذکم بما عقدتم الأیمان) *بەلام لەسەر سوێندێک ئەتان گرێ کەبەدڵ بەستبێتتان، وەمەبەستان بووبێ.*

بەلام لەگەڵ ئەم هەموو عەفوو چاوپۆشییەشدا خوای گەورە لەگەڵیا کردووین، وەئەم سوێندانەی لێ نەگرتووین، پێویستە کە موسڵمان ئەوەندە بێ موبالات نەبێ، وەبەبێ هوودە ئەوەندە ناوی خوای گەورە نەبات و سوێندی پێ نەخوات، وە بەشتێکی وا سووکی نەزانێ، وەهەوڵ بدات بۆ دەست لێ هەڵگرتنی.

**جۆری دووەم:**

سوێندێکە، یەکێک بیخوات لەسەرکردنی کارێکی بەم ڕەنگە بڵێ: بەخوا فلان کەس ئەکوژم، یا جارێکی تر ناچمە لای باوکم، یالای دایکم، یالای خوشکم، یالای برام، یا قسە لەگەڵ فلان هاوڕێما ناکەم. یاسوێند بخوات لەسەر نەکردنی کارێکی باش بەم ڕەنگە داوای یارمەتی لێبکەن بۆ خێرێک، ئەویش بڵێ: بەخوا ئەم خێرە ناکەم، لەپاشا پەشیمان ببێتەوە لەم سوێندانە. لەم کاتانەدا خوای گەورە و بەڕەحم دەست لەحەقی خۆی هەڵ ئەگرێ بۆ ئەوەی تۆ توشی گوناهێک نەبیت، وە ئەفەرموێ: سوێندەکەت بشکێنە و پیاوەکە مەکوژە، یابچۆرەوە لای باوک و دایکت یاخوشک و براکانت، قسە لەگەڵ هاوڕێکەتا بکە، یائەو خێرەی کەسوێندت خواردووە نەیکەیت، بچۆ بیکە وسوێندەکەت بشکێنە، چونکە گوناهی ئەمانە لە گوناهی سوێندکەوتنەکەت قورستر و گەورەترە، ئینجا دوای ئەوەی سوێندەکەت شکاند بچۆ کەفارەتی سوێندەکەت بدە وەک قورئان ئەفەرموێ: (فكفارته اطعام عشرة مساكين من اوسط ماتطعمون اهليكم) *واتە کەفارەتی ئەم جۆرە سوێندانە، کەشکێنرا، نان دانە بە دە هەژار، لەخواردەمەنی‌یەک کە ئەیدەن بەماڵ و منداڵی خۆتان* (او كسوتهم او تحرير رقبة) *یا دە کراسیان بۆ بکەن، وەیابەندەیەک ئازاد بکەن* (فمن لم يجد فصيام ثلاثة ايام ذلك كفارة ايمانكم) *واتە ئەگەر یەکێک لەبەر هەژاری نەیتوانی نانی دە کەس بدات، یا دە کراسیان بۆبکات، یا عەبدیک ئازاد بکات با سێ ڕۆژ بە ڕۆژووبێ، ئەمەیە، کەفارەتی ئەو سوێندانەی کەئەیخۆن و ئەیشکێنن* وە ئاگاداری سوێندەکانتان بکەن بەم کەفارەتە.

**جۆری سێهەم:**

لەسوێند ئەوەیە کە ئادەمی سوێند بخوات بەدرۆ بۆ ئەوەی حەقێک بکات بەناحەق، یاناحەقێک بکات بەحەق، بەم ڕەنگە قەرزی یەکێکت بەسەرەوە بێ و سوێند بخۆیت کە قەرزەکەت داوەتەوە، وە خۆشت بزانی کەنەتداوەتەوە و درۆ ئەکەیت، یایەکێک بەدرۆ بەیەکێک بڵێ دە دینارم قەرز لەلاتە، وەیەک لەسەر یەک سوێندێ درۆی لەسەر بخوات، وەخۆشی بزانێ کەدرۆ ئەکات.

پێغەمبەرﷺ ئەم جۆرە سوێندانە ناوبردووە بە (یمینی غەمووس) یەعنی سوێندێکە ئادەمی ئەباتە خوارەوە بەئاگری جەهەنەما تا تیا نوقوم ئەبێ،

خوای گەورە ئەم جۆرە سوێندانەی داناوە لەڕیزی گوناهە هەرە گەورەکانا، وە کردوونی بە دووهەمی بت پەرستنو شەریک بۆخوا پەیدا کردن، وەک قورئان ئەفەرموێ (فاجتنبوا الرجس من الاوثان واجتنبوا قول الزور) *واتە خۆتان بپارێزن لەبت پەرستی وەلەسوێندی درۆو شەهادەتی درۆو قسەی درۆ،* ئەمڕۆ کەجمعەیە. بالەم ڕۆژە پیرۆزەدا، وەلەم شوێنە موبارەکەدا، پەیمان ببەستین لەسەر دەستی خوا و پێغەمبەر و ئەم موسڵمانانەدا، کەلەمەولا تابتوانین سوێند نەخۆین نەبەڕاست و نەبەدرۆ. ساخوا هیدایەتمان بدات بۆ ڕێی دین، وەبۆ ڕێی ساڵحان وپیاو چاکان.



# ئاگاداریی سپاردە

**ئەی موسڵمانینە**

خوا لەپەردەی تصویر وتمثیلا ئەفەرموێ (انا عرضنا الأمانة علی السماوات والأرض والجبال فابین ان یحملنها واشفقن منها وحملها الأنسان) *یەعنی ئەمانەتی بەمەعنا واجبات وتکالیفی شەرعی لەمەعنا دا ئەمەندە قورس و گرانە، ئەگەر بدرایە بەسەر ئاسمان و زەوی‌دا نەیان ئەتوانی هەڵی گرن -چونکە ئەمانە هیچیان خاوەنی عەقڵ و شعور، وەشایستەی هەڵگرتنی تەکالیفی شەرعی نیین، وەهەموو بەزبانی حاڵ حاشایان کرد لەهەڵگرتنی ئەمانەت- بەڵام ئادەمی -بەهۆی ئەوەی کەخاوەنی عەقڵ و شعورە، وەئەهلە بۆ فەرمانبەری ئەوامرو نەواهی خوا- باری ئەمانەتی هەڵگرت، وەچووە ژێری،* ئینجا بابزانیین ئەم ئەمانەتە چی‌یە؟

هەرچی واجبات هەیە هەمووی ئەمانەتی خوان لە گەردنمانا، ئەبێ خیانەتیان تیا نەکەین، وەیەک بەیەک بەجێیان بێنین، وەهەرچی محرمات هەیە کە دین قەدەغەی لێکردوون هەمووی ئەمانەتی خوان ئەبێ نزیکیان نەکەوینەوە، یەعنی نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات ئەمانەتی خوان لەئەستۆماندان، ئەبێ خیانەتیان تیانەکەین، وەلەوەختی خۆیانا بیانکەین.

**هەر ئەندامێک کەخوا بەئینسانی داوە ئەمانەتێکە بۆ خۆی، بەم ڕەنگە چاو ئەمانەتی خوایە ئەبێ تەماشای نامەحرەمی پێ نەکەین.** خوا ئەفەرموێ (یعلم خائنة الأعین وما تخفي الصدور) ***یەعنی خوا ئاگادارە بە خیانەتی چاوتان و دڵتان،*** **گوێچکە ئەمانەتی خوایە، نابێ گوێی پێبگرین لە غەیبەت و قسەی خراپ، خوا لە ڕۆژی خۆیا موحاسەبەی ئەم ئەندامانەمان لەگەڵدا ئەکات وەکو ئەفەرموێ:** (ان السمع والبصر والفؤاد کل اولئك کان عنه مسئولا) *یەعنی گوێتان، چاوتان دڵتان ئەمانەتی خوان یەک بەیەک پرسیارتان لێ ئەکرێ وەمحاسبە ئەکرێن لەسەرکردەوەیان.*

زمانتان، دەستتان، **قاچتان**، ئەمانەتی خوان، نابێ لەئیشی خراپا بەکاریان بێنن خوا ئەفەرموێ (یوم تشهد علیهم السنتهم وایدیهم وارجلهم بما کانوا یعملون) *یەعنی لەڕۆژی خۆیا زمانتان، دەستان قاچتان شەهادەت ئەدەن لەسەر کردەوەکانیان.*

هەر وا گەنجی و جاهیلی، ئەبێ خیانەتی لێ نەکەن، وەئیشی بێ شەرعی تیانە کەن. لەڕۆژی خویا پرسیارتان لێ ئەکرێ: کەگەنجیی وجاهیلیتان چۆن بەسەر برد؟ عەمرتان لەچی دا بەخت کرد؟ دەقیقەو سەعاتی ژیانتان چۆن بردە سەر؟ خزمەت و خواپەرستی و ئیشی باشتان تیا کرد؟ یا ئیشی بێ شەرعیتان تیا کرد؟ وەک قورئان ئەفەرموێ (ثم لتسألن يومئذ عن النعيم) یەعنی *لەڕۆژی دوایی‌دا پرسیاری هەموو جۆرە نعمەتێکتان لێ‌ئەکرێ*. کە یەکێکتان گەنجی و جاهیلی‌یە.

هەر بەم ڕەنگە ماڵو منالتان ئەمانەتی خوان لەلاتان، ئەبێ لەتەربیەو چاودێری‌یاندا خیانەت نەکەن، ژنتان، کوڕتان، کچتان ئەمانەتی خوان لەلاتان، پێویستە بە ڕۆحێکی ئیسلامی پەروەردەیان بکەن وە فێری ڕەوشت و خووی جوان و دەست پاکی و داوێن پاکی یان بکەن، ئێوە مەسئولن لای خوا لەتەربیەی ئەولادەکانتان چاک بن یاخراپ بن، بە دین و بەئەخلاق بن یا بێ دین و بێ اخلاق بن لە ژێر پەردەو حەیادابن یا لنگ ڕووت وقوڵ هەڵماڵراوبن، قورئان ئەفەرموێ (ياأيها الذين امنوا قوا أنفسكم واهليكم نارا) *واتە ئەی موسلمانینە خۆتان وماڵ ومنالتان بپارێزن لەئاگری (جهنم)*.

ئەمانەت وەنەبێ هەر عبارەت بێ لەماڵ ولە ئەولاد، بەڵکو علمی عولەماو سنعەتی سنعەتکاران و، وەظیفەی موظف و، دەوڵەت وحورمەتی دەوڵەمەندانیش ئەمانەتی خوان لەلایان، خوا ئەو دەوڵەت وحورمەتەی نەداونێ کەدەعیەو دەماری پێ بکەن بەسەر فەقیرو هەژارانا. بەڵکو بۆ ئەوەی داونێ کەدەستی هەژاران ولێقەوماوانی پێ بگرن، وەئاوڕی لە لێقەوماوان پێ بدەنەوە، دینی ئیسلام بەشێکی ئاشکرای لەماڵی دەوڵەمەند داناوە بۆ هەژاران، قورئان ئەفەرموێ (وفي اموالهم حق للسائل والمحروم) یەعنی *هەژار حەقی هەیە لەماڵی دەوڵەمەند دا*، وەدارایی دەوڵەمەند ئەمانەتی خوایە لای دەوڵەمەندە کەئەبێ خیانەتی تیا نەکاو حەقی هەژاری لێ بدا.

ئەی علمای دین، ئەی پێشەوایانی میللەت ئەمانەتی ئێوە زۆرپیرۆزو گەورەیە، میللەت و ئەخلاقی میللەت لەئێوە مەسئولە. ئەبێ بەچرای علمو عرفان ودینەوە پێش میللەت بکەون، ڕێگای تاریک و شەوی ئەموستە چاویان بۆ ڕووناک بکەنەوە.

ئەی مامۆستایانی قوتابخانە: ئەمانەتی ئێوە زۆر گەورەو پیرۆزە ئەمانەتی ئێوە تەربیەو تەعلیمی ڕۆڵە و جگەر گۆشەی میللەتە. ئەمانەتی ئێوە پەروەردە کردن و بەرهەم هێنانی پەڕەی جەرگی باوکان ودایکانە ئەمانەتی ئێوە ئەم منالە بچکۆلانانەن کە پیاوی پاشەڕۆژ و فریا ڕەسی میللەتن ئەمانەتی ئێوە ئەم قوتابی‌یانەن لەقوتابخانە کە وەک ئاوێنەیەکی پاکی بێگەرد، یاوەک کتێبێکی نەنوسراو وانە. بۆ ئەوەیان ئەنێرنە مەکتەب

کەمەرچی ڕەوشت و خووی جوان و ئەخلاقی بەرز هەیە لەو کتێبە نەنووسراوەدا بۆیان بنووسن، وەخۆشتان وەک پێغەمبەران (علیهم السلام) سەرچاوەی ڕاستی و کانگای ئەخلاق و فضیلە بن.

ئەی مامۆستاکان: ئێوە مامۆستای تەربیە و تەعلیمن، وە پێشەوا و ئامۆژگاری ئەولادی موسڵمانانن، نەخوێندەوار لەئێوەوە فێری خوێندەواری ئەبێ. لەئێوەوە فێری ئەخلاقی بەرز دەبێ، ئەبێ ئەگەر خوانەخواستە ئێوە فاسد بوون ئیتر ئەوە ڕۆژی ڕەشی ئەو میلەتەیە وەئەو ڕۆژەیە کە هەموو گەلێک لێی ئەترسێ.

یامعشر القراء یاملح البلد
مایصلح الملح اذا الملح فسد؟

واتە هەموو شتێک بەخوێ ئەپارێزرێ کە بۆگەن بێ ئەی ئەگەر خوێ خۆی بۆگەن بوو چی بکەین، خولاسە هەرچی پێویستی یەکی شەرعی و قانونی و انسانی و کۆمەڵایەتی هەیە، هەمووی ئەمانەتی خوان، لەئەستۆماندا، ئەبێ ئاگاداریان بکەین، و خیانەتیان تیانەکەین، وەک قورئان ئەفەرموێ: (یا ایها الذین امنوا لا تخونوا الله والرسول وتخونوا اماناتکم وانتم تعلمون) *واتە:- ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە خیانەت لە خواو لە پێغەمبەر مەکەن، خیانەت لە ئەمانەت مەکەن*، خوا ڕەحمەمان پێ بکات وە لەژێر باری تەکالیفی شەرعی واجیباتدا سەرکەوتوومان بکات...



# پێرستی بابەتەکان

# بهجة المنبر

تاليف الشيخ محمد الخال

الطبعة الأولى

١٤١٨هـ ١٩٩٧م

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر
سلێمانی - بازاڕی ڕاپەڕین

وێنەی ڕووی بەرگ « مزگەوتی خانەقای مولانا خالد . لە سلێمانی
شوێنی خوێندنەوەی ئەم وتارانە